# یاداشتنامەی پزیشکێک لە کوردستان و ئەڵمانیا

د . شوان عوسمان ئەمین

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

ناوی کتێب: یادداشتنامەی پزیشکێک لە کوردستان و ئەڵمانیا
ناوی نووسەر: د. شوان عوسمان ئەمین
ڕێکخستن و سەرپەرشتی : د. بەنان قاسم
دیزاینی بەرگ: موحەممەد گەلالی
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢١
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٦١١)ـی ساڵی (٢٠٢١)ـی پێ دراوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

**با کردارەکانت گەورە بن،**

**هەروەک چۆن بیر و بۆچوونەکانت گەورەن.**

ویلیام شکسپیر

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## پێشکەشە بە:

* هەموو ئەو پزیشک و قوتابیانەی بەرگەی زەحمەتییەکانی ژیان لە دەرەوەی وڵات دەگرن، لەپێناو بەدەستهێنانی بڕوانامە و دواتر دەگەڕێنەوە بۆ خزمەتکردنی وڵات و هاونیشتیمانیانی خۆیان.

* هەموو ئەو پزیشکانەی لە هەوڵدان بۆ بەرەوپێشبردنی پیشە و سیستەمی تەندروستی، بە هەموو ئەوانەی خاوەن ئامانجی گەورەن و لەپێناویدا هەوڵ دەدەن.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

# پێڕست





WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

# پێشەکی

تەواوکردنی کۆلێژی پزیشکی و هەڵگرتنی پیشگری ‹پزیشک› بۆ هەندێک مرۆڤ خۆشییەکی لە رادەبەدەرە و پێوانە ناکرێ، بەلام لەهەمان کاتدا سەرەتای رێگایەکی دوور و درێژە و تەواوکاری زیاتری پێویستە.

پێم وایە بەدەستهێنانی بڕوانامەی پسپۆری، خەونی هەموو پزیشکێکە، لەپێناو ئەوەشدا زۆر ئاستەنگ و قۆناغ هەن کە پێویستە ببڕدرێ.

خوێندن بۆ پسپۆری لە دەرەوەی ولات، یەکێ لەو خۆشییانە بوو کە لەیەکێک لە وێستگەکانی ژیانم تێیدا ژیام، لەگەڵ کولتوور و زمان و نەتەوەیەکی جیاوازدا.

یەکێکی تر لەو خۆشییە حەتمییانە ئەوەیە کە کاتێ بە سەرکەوتوویی ئەو قۆناغە تەواو دەکەی و دەگەڕێیتەوە ناو خاک و ولاتی خۆت و خزمەتی هاونیشتیمانیان و خێزان و ولاتی خۆت دەکەی لەرێگای پسپۆرییەکەتەوە. ئەمە خۆی کارێکی پیرۆز و ناوازیە، ئارامبەخش و ماندوو ڕەوێنە لەهەمان کاتدا.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ژیـان لەنـاو ئـەو کولتـوور و نەتـەوە و وڵاتـە نوێیـە، لەسـەرەتادا ئاسـان نەبـوو، تووشـی ئاسـتەنگ و زەحمەتـی بوویـن و دەبوویـن، بـەڵام گشـتیان تەواوکـەری ئـەو ڕێگایـە بـوون کـە وەک ئامانجـی سـەرەکی بـۆی هاتبوویـن.

دوابەدوای تەواوبوونـی بەشـێک لـەو یادداشـتنامەیەی ژیانـم، هیوام دەخواسـت لـە سـەرەتای چوونـم بـۆ ئەڵمانیـا، کتێبێکی وام لەبەردەسـت بووایە، بۆئەوەی زیاتـر ئاشـنا بووبـام بـەو گۆڕانکارییانەی کـە دەهاتنە ڕێـم و زیاتـر شـارەزای شـێواز و چۆنییەتـی ژیانیـان بووبـام.

ئومێد دەکـەم ئـەم دێڕانـە، ئـەم ئەزموونانـە، هـاوکار و یارمەتیـدەر بن بۆ ئەوانـەی لـە دەرەوەن و لە سـەرەتای ڕێگادان، یاخوود ئەوانەی کە بەنیـازن بـۆ خوێندنـی بـاڵا و پسـپۆڕی ڕووبکەنـە دەرەوەی وڵات.

هەمـوو کارێکـی پـڕ ئەسـتەم، ئەنجامـی جـوان و خزمەتـی زۆر دەبەخشـێ.

بە هیوای چێژ وەرگرتن لە کاتی خوێندنەوەیدا.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کاروانی ژیانی هەریەکێکمان پڕە لە وێستگەی جۆراوجۆر و هەوڵ و ماندووبوون بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو، پڕە لە تێکۆشان و شەونخوونی بۆی.

خوێندن و ئەرکەکانی خوێندن لە قۆناغە جیاجیاکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی، هەوڵ و تێکۆشانێکی تایبەتی دەوێ، جیا لەمانە خوێندن لە کۆلێژی پزیشکی ئەرک و شەونخوونی زۆر زیاتری گەرەک بوو لە قۆناغەکانی پێشووتر، جگە لە لایەنە تیۆرییەکە، هەوڵدان بۆ پراکتیزەکردنی پیشەکەش، زەحمەتی و تێکۆشانی خۆی دەویست.

دەمەوێ زیاتر تیشکی خامەم بخەمە سەر ساڵانی دوای دەرچوونم لە کۆلێژی پزیشکی، لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٠ بوو وەک پزیشک لە زانکۆی صلاح الدین / هەولێر دەرچووم.

بوون بە پزیشک هەر لە سەرەتاکانی تەمەنمەوە خەونێک بوو بۆم و هەمیشە بە پاڵپشتی ماڵەوەشمان کارم بۆی کردووە و ئەوەی وەک قوتابییەک لەسەرم پێویست بووە کردبووم بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا بتوانم ببم بە پزیشک و بتوانم لە ڕێگای ئەم پیشەیەوە، خزمەتی مرۆڤایەتی و خەڵکی بکەم.

شایەنی باسە لە خانەوادەکەی ئێمەدا، دەتوانم بڵێم یەکەم پزیشک بووم، زۆر کەسی سەرکەوتوو لە بوارەکانی تردا هەبوون،



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

وەک هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا لە بوارە جیاجیاکاندا، خۆی ڕەنگە ئەمە بەشێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ هەمیشە هاندەر و پاڵپشتی من بووبێ و خولیای خوێندن و هەوڵدانی لا زیاتر کردبم، بەڵام لە لایەنی پزیشکییەوە، دەتوانم بڵێم یەکەم پزیشک بووم.

دیوێکی دیکەی پیشەی پزیشکی ئەوەیە کە، خەڵکی وڵاتی خۆمان بە شێوەیەکی گشتی پێیان خۆشە منداڵەکانیان ببنە پزیشک، دایک و باوک و خزم و دۆست شانازیان پێوە دەکردی و پزیشک ڕێزێکی تایبەت و پێگەیەکی دیاری هەبووە لای کۆمەڵانی خەڵک.

بۆیە لە ڕوانگەی منەوە ئەوەی دەبێتە پزیشک، هەم بەشێک لە خۆی بۆ خەڵکە و هەمیش هەستەکانیشی بەشێکیان بۆ خەڵکن.

چونکە بە چاوێکی ترەوە سەیر دەکرێی و ڕێزێکی تایبەتت لێ دەگیرا، ئەمانە وای دەکرد کە پزیشکان بە خۆیشمەوە، باشتر و جوانتر و زۆرتر خزمەت بکەین، بەجۆرێک شایەن بەو ڕێز و پلەیە بیت کە پێت بەخشراوە و لێتەوە چاوەڕوان دەکردێ.

## دامەزراندنمان وەک پزیشکی نیشتەجێی خولاو

دوای دەرچوونمان، یەکێ لە قۆناغە حەتمییەکانی هەر پزیشکێکی تازە دەرچوو، ئەوەیە کە دەبێ دوو ساڵ بە ناونیشانی پزیشکی نیشتەجێی خولاو، لە نەخۆشخانە و فریاکەوتنەکانی ناو شار و دەرەوەی شار کار بکات، بۆ هەر مانگێک لە یەکێ لە فریاکەوتنەکان، یاخوود لەو نەخۆشخانانەی کە نەخۆشیان لێ دەخەوێندرا.

دەستپێکی ئەم قۆناغەمان زۆر پر چێژ بوو بۆمان، پزیشکی گەنجی پڕ وزە بووین.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئـەوکات یەکـەم وێـستگەی کارکردنـم نەخۆشـخانەی فریاکەوتنـی کۆمـاری (جمهوری ) بـوو، هەسـتێکی زۆر خۆشـبوو، کـە لـە ڕێگای پیشـەکەمانەوە دەمانتوانـی ڕۆژانـە خزمەتـی چەندەهـا نەخۆشـی جیاجیـا بکەیـن، لەگـەڵ جۆرەهـا مـرۆڤ کارمـان دەکـرد: گەنـج، پیـر، منـداڵ... هەمـوو جۆرێـک.

ئەمـە خـۆی لەخۆیـدا ئەزموونێک بـوو، پڕ بـوو لـە وانـە بۆمـان و ڕۆژانـە تووشـیان دەبوویـن.

هـەر لـە سـاڵی یەکەمـی کارکردنـم بـە نـاو نیشـانی پزیشـکی نیشـتەجێی خـولاو، بـۆ مـاوەی هەشـت مانـگ لـە نەخۆشـخانەی فریاکەوتنی کۆمـاری کارم کـرد، بـە حوکمـی حـەز و خولیام بۆ بواری پزیشـکی هەنـاو و ئێمێرجنسـی.

ڕۆژانـە ٦-٨ کاتژمێـر کارمـان دەکـرد و لـەو ماوەیـەدا جـاری وا هەبـوو زیاتـر لـە ٢٠٠ نەخـۆش دەبینـران و زیاتریـش حاڵەتـە لەنـاکاوەکان بوون، وەک: شـکان، بەربوونـەوە، سـووتان، نۆبـەی دڵ و مێشـک... و جۆرەهـا حاڵەتـی تـر.

هـەر لە هەمـان سـاڵ، ئەزموونێکـی خۆشـی کارکردنم کـرد، لەگـەڵ تیمێکـی تایبـەت لەلایـەن ڕێکخـراوە تەندروسـتییە جیهانییـەکان، بـۆ پێدانـی پێ ە دژی نەخۆشـی پۆلیـۆ، ئـەو نەخۆشـییەی کـە لـە ڕێگای هەوکردنـی دەمارەکانـەوە منداڵی تووشـی شـەلەل بوون دەکرد- لەگەڵ ئـەم تیمـە، هەڵبژێردرابـووم بۆ گـەڕان بـە نـاو گونـد و شـارۆچکەکانی سـەر بـە قـەزای سـۆران و خەلیفـان و گوندەکانـی سـەر بـە ناوچـەی بـارزان، بۆ ئـەوەی پێکوتـە (لقـاح) بدەیـن بـەو منداڵانـە.

هەنـدێ جـار تووشـی زەحمەتـی دەبووین، دایـک و باوکی هەندێکیان هۆشـیاری تەندروسـتییان نەبـوو و ڕێگایـان نـەدەدا کـە منداڵەکانیـان بکوتیـن، بـە بەهانـەی ئـەوەی کـە خـودی پێکوتەکـە جـۆرە ڤایرۆسـێکە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

و زیانی هەیە بۆ منداڵەکە، دەبووا قسەمان لەگەڵ کردبان و بۆمان ڕوون کردبانەوە کە شتەکان چۆنن، خۆشبەختانە ڕەزامەندییان پیشان دەدا و منداڵەکانیان دەکوتان.

دواتر لە ساڵی دووەمی پیشەکەمان، هەر بە ناونیشانی پزیشکی نیشتەجێی خولاو، لە نەخۆشخانەکانی ناو شار دەواممان دەکرد، بە سیستەمی ئێشکگری، بەیانیانیش لەگەڵ پزیشکی پسپۆر ئەو نەخۆشانەی کە خەوێندرابوون، دەمان بینین.

لەگەڵ ماندووبوون و ئێشکگری زۆر، لە بەرامبەر کەمکردنەوەی ئازاری نەخۆشەکانمان هەمیشە هەستمان بە ئارامی دەکرد، شتێکی تر کە دەمەوێ باسی بکەم، مانەوەی پزیشکان بوو لە خانەی پزیشکان (دار الأطباء)، کە لە هەرسێ نەخۆشخانەی ڕزگاری، کۆماری، لەدایکبوون و ئافرەتان هەبوون.

نانخواردنی سێ ژەمە و پشوودان و مانەوەی شەوانەمان لەوێ بوو، لەگەڵ هاوڕێکانمان بەیەکەوە.

لە نەخۆشخانەی ڕزگاری (کاک ستار و مام دەروێش) هەبوون، لە نەخۆشخانەی کۆماریش (مام مەجید)، لە نەخۆشخانەی ئافرەتان و لە دایکبوونیش (کاک ئاودێر) هەبوو، چێشتلێنەر بوون و خواردنی بەتامیان بۆ ئامادە دەکردین.

بەهۆی پەیوەندی ڕۆژانەمانەوە، بەشێوەیەکی گشتی نێوانیان لەگەڵ بەشێکی باش لە پزیشکان خۆش بوو.

مام مەجید مرۆڤێکی خزمەتبەخش و یارمەتیدەر بوو. بە یەکێ لە کارمەندە هەرە دێرینەکانی خانەی پزیشکان دەژمێردرا. بەهۆی زۆر کارکردنی لەوێ، بەشێکی زۆر لە پزیشکە دێرینەکانی شاری هەولێری دەناسی و لەگەڵیان ژیابوو، زۆر جار باس و خواسی خۆشی ئەوانی بۆ دەگێرڕاینەوە کە پێشووتر لە خانەی پزیشکان گوزەرابوو.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بە داخەوە، ماوەیەک بەر لە ئێستا بە نەخۆشی دڵ کۆچی دوایی کرد.

زۆرجار دوای تەواوبوونی دەوامەمان و گەڕانەوەمان بۆ خانەی پزیشکان، لە نەخۆشخانەی ڕزگاری یاری تۆپێنمان دەکرد، هەندێ جار هەر بە جلی دەوامەوە بێ ئەوەی خۆشمان بگۆڕین دەستمان بە یاریکردن دەکرد.

دواتر باسی هەمان خاڵ دەکەمەوە لە ژیانم لە ئەڵمانیا و پێم خۆشە بەراوردێک بکەم.

هەمیشە پرسیارمان دەکرد، لە پزیشکانی پێش خۆمان و بۆچوونەکانیانمان بەهەند وەردەگرت.

دوای ڕاوێژکردن لەگەڵ پزیشکانی نیشتەجێی دێرین، بەیەکەوە بڕیارمان لەسەر باری تەندروستی نەخۆشەکە دەدا و کارەکان بە هەماهەنگی لەگەڵ ئەوان ئەنجامدەدران، نەزانین نەبوو، بەڵکو گرنگیدان بوو بە کاری تیم و زیاتر دڵنیایی کردنەوە بوو بۆ سەلامەتی نەخۆشەکان.

##ساڵی سێیەم و قۆناغی پزیشکی پلەبەندی

دواتر لە ساڵی سێیەمی پیشەکەمانەوە، ناونیشانمان گۆڕا بۆ پزیشکی پلەبەند (تدروج)

لەو ساڵەدا لە نەخۆشخانەکانی دەرەوەی شار دەوامەمان دەکرد، من لە نەخۆشخانەی ملازم کەریم بووم لە پیرمام، بۆماوەی زیاتر لە نۆ مانگ وە لە نەخۆشخانەی شەقڵاوە بۆ ماوەی سێ مانگ.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەو ساڵەدا بەیانیان نەخۆشەکانی سەر بە شارۆچکەی پیرمام/ مصیف دەهاتن و بەپێی پێویستی کارمان بۆ دەکردن. ئەوکات شیفتی ئێشکگریشمان هەبوو.

## داواکاری پێشکەشکردن بۆ پسپۆری و خوێندنی بۆرد

دواتر داواکاری بەشە پزیشکییەکان بۆ پسپۆری کرایەوە، بەحوکمی ئەوەی کە خوشکێکم نەخۆشی تالاسیمیای هەبوو، بڕیاری ئەوەم دابوو کە پسپۆری نەخۆشییەکانی خوێن- سەر بە تاقیگەکان بخوێنم، بۆیە داواکاریم پێشکەشی ئەم بەشە کرد و بۆ ماوەی شەش مانگ وەک پزیشکی نیشتەجێی دێرین لە نەخۆشییەکانی خوێن/ لە نەخۆشخانەی ڕزگاری کارم کرد، بەڵام دواتر تێگەیشتم کە ناکرێ لەبەر هۆکارێکی سۆزداری بڕیاری دەستنیشانکردنی پسپۆری بدەیت، ئەوە لە کاتێکدا کە خۆم هەر لە سەرەتاوە ویست و خولیای زۆرم بۆ بەشی هەناو و دڵ هەبوو، دەستم لەو بەشە هەڵگرت و گەڕامەوە و درێژەم بە تەواوکردنی ماوەی پلەبەندیم دا، کە سێ مانگ بوو، لە نەخۆشخانەی شەقڵاوە، تەواوم کرد و دواتر دووبارە تقدیمات کرایەوە و خۆم بۆ بەشی نەخۆشییەکانی هەناو و دڵ یەکلایی کربووەوە، داواکاریم پێشکەشکرد و وەک پزیشکی نیشتەجێی دێرینی هەناو وەرگیرام.

شوێنی کارکردنم نەخۆشخانەی کۆماری و ڕزگاری بوو، ئێشکگری فریاکەوتنەکان و قاوشەکانی هەناوی نەخۆشخانەی ڕزگاری و بەشی گورچیلەی دەستکردیش لەسەر ئێمە بوو، پزیشکانی نیشتەجێی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دێرینی هەناو، ئەرکێکی زەحمەت و ماندوو بوونێکی زۆرمان لەسەر بوو، بەڵام ئەوەی دڵی خۆش دەکردین ئەوە بوو کە دەمانتوانی لە ناخۆشی و نەهامەتییەکانی نەخۆشەکانمان کەم بکەینەوە.

## ویستی خوێندن لە دەرەوەی وڵات

دوای کارکردنم لە سێکتەری تەندروستی هەولێر بۆ ماوەی چوار ساڵ (دوو ساڵ وەک پزیشکی نیشتەجێی خولاو، ساڵێک وەک پزیشکی پلەبەند و ساڵێکیش وەک پزیشکی نیشتەجێی دێرینی نەخۆشییەکانی هەناو و دڵ)، وردە وردە ویستی خوێندن لە دەرەوەی وڵات زیاتر سەرقاڵی دەکردم و زۆرتر بیرم لێ دەکردەوە، ئەوە لە کاتێکدا کە بەشێک لە هاوپیشەکانمان دەستیان کردبوو بە ڕێ و شوێنی پێویست بۆ خوێندن لە وڵاتانی ئەوروپا و بەتایبەت بەریتانیا.

دەمانپرسی و لێمان دەکۆڵییەوە. هەندێکیان بەڕێگای فەرمی و هەندێکیان لەڕێگای سکۆلارشیپ لەلایان زانکۆکانەوە دەستیان پێکردبوو.

من و کۆمەڵێک هاوڕێشم بڕیارمان دا ڕێگایەک بدۆزینەوە بۆ ئەوەی بتوانین بڕۆین و لە دەرەوە دەست بە خوێندنی باڵا -بۆرد/ دکتۆرا- بکەین. لەڕێگای کەسێکەوە بازرگانێکیان پێ ناساندین، کە گوایە دەیتوانی بمانگەیەنێتە وڵاتی ڕووسیا، دواتر ئەڵمانیا و لەوێشەوە بۆ بەریتانیا، بەڵام سوپاس بۆ خوا هەر زوو لەو ڕێگایە دەستمان هەڵگرت و بڕیارمان دا بە شێوەیەکی یاسایی و بێ کێشە بچین.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

له كوردستان و له عیراق بۆرد/ دكتۆرا بۆ پسپۆری دەخوێندرا، وەک بۆردی عەرەبی و دبلۆم -ماستەر- له كوردستان. ئامانجی ئێمه ئەوه بوو ئەو دكتۆرايه له دەرەوه و له وڵاتێكی ئەورووپی بخوێنین، شایەنی باسه له كاری پێشەكەشكردنی ڤیزا بۆ ئەڵمانیا، یاسای ئەو وڵاته وای دەخواست كه دەبێ یەكێ هەبێ لەوێ پاڵپشتیت بكات، لەبەر ئەوەی دۆخی ئاسایشی عیراق ئەوكات ناسەقامگیر بوو، زۆر هەوڵمان دا، كەسمان دەست نەكەوت لەوێ بژییێت و بتوانێ هاوكارمان بێت.

دواتر له رێگای یەكێ له هاورێكانی باوكمەوه كه ناوی بەرێز وریا حەمەد ئەمین ئەحمەد دزەیی بوو، ئەندامی پێشووی پەرلەمانی كوردستان بوو، هاوكاری كردین و ئێمەی به كاك ئەحمەد سلێمان قرنی، ناسراو به ئەحمەد تقاعد ناساند له ئەڵمانیا و ئەو كارەكانی بۆ كردین.

بەرێز ئەحمەد تقاعد بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی خانەنشینی هەولێر بوو-١٩٦٠ وه كەسایەتییەكی شاری هەولێره، له سالانی هەشتاكان كوردستانی جێهێشت و چووه ئەڵمانیا و لەوێ نیشتەجێ بوو.

دواتر ئەو یاساییه هەڵگیرا و چی تر كاری پێ نەكرا.

ئیمێڵێكمان نارد بۆ بەرێز فراو هایدا باوەر السوفی، كه بەڕێوبەری تۆماری زانكۆی زارلاند بوو. به ڕەگەز خەڵكی ڤییەننا بوو. خۆی بۆ ماوەیەكی زۆر له وڵاتی مصر ژیابوو، هەر لەوێش لەگەڵ یەكێ له مامۆستاكانی خۆی پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام دابوو، زمانەكەش زۆر باش فێر ببوو.

هاورێكەمان له رێگای مامییەوه ناسیبووی، پەیوەندیمان پێوه

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کرد و پێمان ڕاگەیاند کە ئێمە کۆمەڵێک دکتۆرین دەمانەوێت لە وڵاتی ئەڵمانیا دەست بە خوێندن بکەین و پسپۆری بخوێنین.
خۆشبەختانە وەڵامی ئیمێلەکەی زۆر ئەرێنی بوو.

دواتر دۆکیومێنتی پێویستمان بۆ نارد، تاکو بتوانین ڕێککارەکانی تایبەت بە پێشکەشکردنی ڤیزا بگرینە بەر.
ئیتر لە ڕێگای (د. نیهاد و دکتۆر فراو باور السوفی)یەوە توانیمان بانگهێشتنامەکان لەو نەخۆشخانە وەربگرین، کە پێمان خۆشبوو پسپۆری لێ وەربگرین و دەست بە خوێندن بکەین.
پێمخۆشە باسی ڕۆڵی گرنگی بەڕێز دکتۆر جەمال عەبدولحەمید پالآنی بکەم، کە بەڕێزیان وەزیری تەندروستی ئەو کات بوو.
سەردانمان کرد و پێمان ڕاگەیان کە ئێمە نیازی گەشتمان هەیە بۆ خوێندن لە ئەڵمانیا و فەرمانە کارگێرییەکانمان پێبوو و بردمانە لای، چونکە کەمێک کێشەمان بۆ دروست ببوو، هەڵوێستی جەنابیانمان لە یاد ناچێ کاتێ فایل و فەرمانە کارگێڕی و فۆرمی وەرگیرانمانی لە دەستی خۆی گرت و گوتی: زۆر دڵخۆشم کە بۆ خوێندن ڕوودەکەنە دەرەوەی وڵات و پاڵپشتی خۆی پیشان داین.
لە وڵاتی ئەڵمانیا یاسایەکی تەیبەت هەبوو بۆ ئەو پزیشکانەی لەو وڵاتانەوە دەهاتن کە بە هۆکاری جەنگ ناسەقامگیری تێدابوو.
بەهۆی خراپی باری ڕامیاری و ئاسایشی عیراق و نەبوونی کونسوڵخانەی ئەڵمانیا و فرۆکەخانە، دەبوو بچووباین بۆ وڵاتی ئوردن، تاوەکو ڤیزا پێشکەش بکەین بۆ وڵاتی ئەڵمانیا، بۆیە من و دوو هاوڕێم لە ڕێگای کەرکووکەوە، کە ئەکات مەترسی زۆری تێدابوو، بەڕێکەوتین بۆ بەغداد و لەوێشەوە بۆ ئوردن.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لەو ڕێگا پڕ مەترسییە، تووشی حاڵەتی نەخوازراو بووین، تووشی هێزێکی زۆری سەربازی ئەمریکی بووین، داوایان کرد دابەزین و لە سەر سک ڕاکشاین، ترسێکی زۆرمان لێ نیشتبوو، دواتر ناسنامە و دۆکیومێنتەکانیان دیت و تێگەیشتن بە نیازی خوێندن سەفەر دەکەین، ڕێگایان پێمان دا و ڕۆیشتین.

سوپاس بۆ خوا بە سەلامەتی گەیشتینە عەممان و لەوێ چووینە کونسوڵخانەی ئەڵمانیا و دەستمان کرد بە ڕێککارە یاساییەکان بۆ وەرگرتنی ڤیزای وڵاتی ئەڵمانیا.

ئەوەی جێگای سەرنج بوو ئەو کەسەی پێشوازی لێ کردین، زۆر بە شێوازێکی ناشرین و بە بێ ڕێزییەوە مامەڵەی لەگەڵ کردین، بەتایبەت کە زانیان خەڵکی وڵاتی عێراقین.

بە هۆی هەبوونی جەنگی بەردەوام و نائاسایشی لە عیراق دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس، خەڵکی وڵاتانی دەوروبەر بە چاوێکی کەمەوە سەیری تاکی عیراقییان دەکرد، بە ڕاستی هەستێکی ناخۆش بوو، کاتێ دەبینی وەک مرۆڤێکی ئاسایی مامەڵەت لەگەڵ ناکرێ، تەنها لەبەر ئەوەی خەڵکی وڵاتێکی دیاریکراویت.

بەڵام خۆشبەختانە لە ژوورەوە کاتێ لەگەڵ کارمەندێکی ئەڵمانی مامەڵەمان کرد، هەستمان بە جیاوازی تێڕوانینی هەردوو جۆرە کەسایەتییەکە کرد، زۆر بەڕێزەوە بەدەم داوکارییەکانمانەوە هاتن و گوێیان لێگرتین و بە جوانیش ئەو شتانەیان تێگەیاندین کە لەسەرمان پێویست بوون ئەنجامیان بدەین، ئەو جۆرە مامەڵەیە وای کرد ماندووبوون و زەحمەتی ڕێگا و بێڕێزییەکانی لە بەرامبەرمان کرابوون، بڕەوێتەوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

زۆر گرینگە مرۆڤ بێ گوێدانە ڕەگەز و نەتەوە و ئایینی کەسی بەرامبەر، مامەڵەیەکی جوان و تەندروست بکات، بێ ئەوەی جیاوازی بکات و هەستی کەسی بەرامبەر بریندار بکات.

دواتر پێیان ڕاگەیاندین کە دەبێ چاوەڕێ بکەین تا هەواڵی وەرگرتنی ڤیزاکە تەواو دەبێت، ڕەنگە ماوەی دوو مانگ بخایەنێت، ئیدی ئێمەیش بە دڵێکی خۆشەوە گەڕاینەوە هەولێر و دەستمان کردەوە بە دەوام و ئەرکی ئاسایی خۆمان، وەک پزیشکی نیشتەجێی دێرین لە نەخۆشییەکانی هەناو و دڵ.

دوی دوو مانگ هەواڵیان پێداین کە ڤیزاکانمان دەرچووە و دەتوانین سەفەری وڵاتی ئەڵمانیا بکەین. هەواڵێکی یەکجار خۆشبوو، کاتێ توانیمان ڤیزای وڵاتی ئەڵمانیا وەربگرین بۆ درێژەدان بە خوێندنمان و بە دەستهێنانی پسپۆری پزیشکی.

وا پێویست بوو بڕێک پارە بگەیەنینە ئوردن، بۆ تەواوکردنی کارەکانی تایبەت بە ڤیزاکە، لەبەر هەبوونی مەترسی لە ڕێگای (موصل-دیمەشق-ئوردن ) و ( بەغداد-ئەنبار-ئوردن) گەیاندنی پارەکە بۆ ئوردن، زەحمەت بوو، بەڵام دواتر لە ڕێگای کەسێکەوە کە کۆمپانیایەکی جێگای دڵنیایی هەبوو، توانیمان ڕاسپاردەکان لە ڕێگای ئەو کۆمپانیایەوە بگەیەنینە ئوردن و دواتر کە خۆمان گەیشتینە ئەوێ، پارەکە وەربگرینەوە.

ڕێککارەکانی هێزەکانی سەربازی ئەمریکی لە خاکی عیراق، زۆر توند بوون بە تایبەت دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس، بۆیە بڕیارمان دا ئەمجارە لەڕێی وڵاتی سووریاوە گەشت بکەین و تووشی هەمان مەترسی جاری پێشوو نەبینەوە کە لە ڕێگای ئەنبار تووشمان بوو.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەڕێکەوتین بۆ شاری موصل لەوێشەوە بۆ سنوورەکانی وڵاتی سووریا.

مامەڵەکردن لەگەڵ تاک و پۆلیسی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست زۆر سەختە، بەتایبەت کە دەتەوێ بێ فێڵ بیت و ڕێزیان لێ بگری.
لە یەکەی پاسەپۆرتی سووریا، دەبوو پاسەپۆرتەکان بدرێن بە ئەفسەرێک لە پەنجەرەیەکەوە و بڕی ٥٠$ لە ناوپاسەپۆرتەکە دابنرێت، تاوەکو ئیشەکانت بۆ ڕایی بکەن، دواتر لە لایەکی ترەوە پاسەپۆرتەکەت وەردەگرتەوە.

ڤیزاکانمان وەرگرت و لە بەرواى ٢٠٠٤/٩/١ لە فڕۆکەخانەی فرانکفۆرت لە ئەڵمانیا دابەزین.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## گەیشتنە ئەڵمانیا و دەستپێکی ژیانێکی نوێ

دوای ئـەوەی لـە فڕۆکەخانـەی فرانکفـۆرت دابەزییـن، هەسـتێکی خـۆش و ناخۆمـان هەبـوو، بەتایبـەت کـە یەکمجارمـان بـوو سـەردانی وڵاتێکـی ئەورووپـی بکەیـن، بـەو هەمـوو جیاوازییـە لـە کولتـوور و ئاییـن و ڕەنـگ و شـێوە و زمـان.

ئیـدی هەرچۆنێـک بـوو، ژیانێکـی زۆر نـوێ و تـازە چاوەڕێمانـی دەکـرد.

لە فڕۆکەخانەوە بە شەمەندەفەر بەڕێکەوتین بۆ شاری زارلاند.

ئەڵمانیـا لـە ١٦ ناوچـە -مقاطعـە- پێکدێت، زارلانـد بـە بچووکتریـن ناوچـە دادەنـرێ لـەڕووی دانیشـتووانەوە، نزیکـەی ١٠٤٥٠٠٠ دانیشـتووی لێیـە.

تا ساڵی ١٩٥٥ زارلاند لە ژێر ئیدارەی وڵاتی فەڕەنسا بوو.

زارلانـد دەکەوێتـە باشـووری خۆرئـاوای ئـەو وڵاتـە، هاوسـنوورە لەگـەڵ فەڕەنسـا، دوای جەنگی جیهانـی یەکـەم، لـە دوای سـاڵانی ١٩٢٠ دامـەزراوە و ناوچەیەکـی پیشەسـازی گرینگـە و چەندیـن کۆمپانیـای گرینگـی ئۆتۆمبێلـی لێیـە و لـە لایەنـی ئابوورییـەوە گرنگییەکـی زۆری هەیـە، بەهـۆی هەبوونـی کۆمەڵێـک کانـزای گرینـگ.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خۆی پێشووتر شارێکی سەر بە ناوچەی فەڕەنسییەکان بوو، دواتر دوای جەنگی جیهانی یەکەم بەتەواوی سنووری لەگەڵ فەڕەنسا جیاکردەوە.

**شاری زارلویس -ناوچەی زارلاند ، کە بۆماوەی 2.5 مامەوە لێی.**

مێژوویێکی جوانی هەبوو بۆ هەردوو وڵاتەکە، بەگشتی خەڵکی ئەو شارە هەردوو زمانی فەڕەنسی و ئەڵمانی دەزانن. شتێکی خۆش ئەوە بوو، وەک باسمکرد خاڵی پشکنین نەبوو، خەڵکی بۆ بازاڕکردن دەچوونە بەشێکی فەڕەنسا، یاخود بە پاس دەهاتنە ئەڵمانیا، سنوور و پاسەوان بوونی نەبوو، دوو شەقام هەبوو یەکێکان فەڕەنسا ئەوی تریان ئەڵمانیا.

لەڕووی چێشتخانە و خواردنەوە سادە بوون و زیادەڕۆیی نەدەبیندرا، خواردنگەکان وەک لای خۆمان نەبوون مێزەک پڕ بێت لە خواردن و نیوەی زیاتریش بەفیڕۆ بچێ، بەڵکو ئەوەندەت داوا دەکرد کە پێت دەخورا، ئێمەیش بەرەبەرە فێری ئەو کولتوورەیان بووین، هەوڵمان دەدا کەمترین خواردن بەفیڕۆ بچێت.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لە چێشتخانەی (کاسترۆنۆمی) هەستم بەوە کرد، شێوازی پێشکەشکردنی خواردنەکانیان بە شێوەیەکە کەمترین بەفیرۆچوونی تێدایە، ڕەنگە نرخەکان گران بن، بەڵام هیچی بەفیڕۆناچێ، ئەوەش بەهایەکی جوانە و لەڕووی ئابووری و ژینگەییشەوە گرینگە.

کاتێ گەیشتینە زارلاند، بەڕێز دکتۆر نیهاد لە چاوەڕوانیماندا بوو، بە ئۆتۆمبێلی خۆی ئێمەی گەیاندە ئەو شوێنەی کە بۆ مانەوەمان ئامادەی کردبوو.

من و هاوڕێکانم لە دوو ژووری جیا لەگەڵ خێزانێکی بەڕەگەز ئەڵمانی، لە هەمان خانوودا نیشتەجێ بووین، هاوڕێکەی تریشمان لە بەشە ناوخۆییەک شوێنی بۆ دابین کرا بوو.

## دەستپێکردنی کۆرسی زمان و فێربوونی زمانێکی نوێ

هەر ئەو ڕۆژەی کە گەیشتینە زارلاند، بۆ بەیانییەکەی بە هاوکاری دکتۆر نیهاد، ڕاستەوخۆ پەیوەندیمان بە زانکۆوە کرد بۆ دەستپێکی کۆرسی زمانی ئەڵمانی. کۆرسێکی شەش مانگی بوو، لە ٨ی بەیانی تاوەکو ٤ی ئێوارە بەردەوام دەبوو. سوودێکی زۆرمان لەم کۆرسە وەرگرت، مامۆستاکان بەڕاستی لە هەوڵ بوون بۆ فێرکردنمان، لەو پۆلەی ئێمە نزیکەی ١٦ نەتەوەی جیا جیا هەبوون، بە هۆی ڕووخسار و جلوبەرگ و هەڵسوکەوتیانەوە، تارادەیەک دەمانتوانی پێشبینی ئەوە بکەین کە کام نەتەوەن.

هەموومان لە ئاستی خوێندنی جیا جیا بووین، بەڵام بۆ دەستکردن بە خوێندن لە ئەڵمانیا، دەبوو بە بڕوانامەی ئەم کۆرسە دا ڕۆیشتبایەن.

لە ناو هەموویان تەنها من و دوو هاوڕێم پزیشک بووین.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەزموونێکی جیا بوو لەگەڵ ئەو خەڵکە جیاوازانە و هەستێکی خۆش بوو لەگەڵ کولتوور و نەتەوەی جیا جیا ئاشنایەتی پەیدا بکەی.

لە نزیک سەنتەری کۆرسەکەوە قاوەخانەیەکی لێ بوو، دوای وانەکان لەوێ دادەنیشتین و گفتوگۆمان دەکرد، دەرفەتێکی باشیش بوو بۆ یەکتر ناسین. من و هاورێکانم زیاتر بەیەکەوە بووین و کەمتر تێکەڵیمان دروست دەکرد و دڵنەوایی یەکمان دەکرد بۆ هەستی غەریبیمان، ئەوە خۆی زیانەکەی ئەوە بوو کە بەهۆی بوونی کەسێکی هاو زمان، ڕەنگە کەمتر پراکتیزی زمانە نوێیەکە بکەیت، دەمان بینی ئەوانەی بەتەنیا بوون و خەڵکی شاری خۆیانیان لەگەڵ نەبوو، بۆ گفتوگۆ و لێک تێگەیشتن ناچاربوون زۆرتر زمانی ئەڵمانی بەکاربهێنن، ئەوە وای دەکرد زووتر فێری زمانەکە ببن.

شاری زاربرۆکن-کە کۆرسی زمانمان لێی خوێند

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەڵام خاڵێکی گرینگ ئەوە بوو کە کورد بە شێوەیەکی گشتی لە فێربوونی زمان زیرەکن، بەهۆی ئەوەی جۆرەها پیت و دەنگی بزوێن و نەبزوێن دەتوانن دەرببڕن، جیاوازی ئێمە لەگەڵ نەتەوەکانی تر ئەوەیە کە زمانپاراویمان، هاوکارمانە بۆ فێربوون.

یەکێ لەوانەی ئەوێ باسی دەکرد کە گەشتی کردبوو بۆ تورکیا کوردی بینیووە هاوشێوەی تورک قسەی کردووە، لە فەڕەنسا، لە ئیتاڵیا، لە یۆنان، ئیدی دەیگوت ئێوەی کورد زۆر زوو فێری زمان دەبن و هاوشێوەی نەتەوەکان دەتوانن دەنگ و پیتەکان دەربببڕن.

دەکرێ ئەوان لە ئێمە باشتر بن و شتیان لێوە فێرببین، یاخود ئەوان لە ئێمەوە فێربن، گرینگ ئەوەیە سوود بە یەکتر بگەیەنین.

بەگشتی خەڵکی باشمان ناسی، تاڕادەیەک شارەزای کولتووریان بووین. هاورێیەکمان لەگەڵ بوو ناوی عەبدولڕەحمان بوو، خەڵکی غانا بوو.

کاریگەرییەکانی بینینی بەشێک لە ژیانی خەڵکی وڵاتانی ئەفریقیا، وای لێمان کردبوو وا هەست بکەین کە بەشێکی زۆریان لە نەهامەتیدان و ژیانیان خۆش نییە و لە زەحمەتیدان، ئەو بۆچوونە لامان درووست ببوو کە ڕەنگە زۆر کێشەیان هەبێ و نەتوانن دڵخۆش بن، بەڵام لێکدانەوەکەمان هەڵە بوون و دەمان بینی کە ئەو دانیشتووەی وڵاتێ غانا چەندە دڵخۆش و دەم بە خەندە بوو.

فەڕەنسییەکان زۆر تێکەڵ و ڕووخۆش بوون، شکڵ و شێوەیان ڕێکوپێک بوون.

قوتابییە ڕۆمانییەکان زۆر متمانەیان بەخۆیان بوو، ڕەنگە هۆکارەکە ئەوە بووبێ کە زمانیان زۆر باش دەزانی و کەم تووشی کێشەی لێکتێنەگەیشتن دەبوون.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئێمەی کورد بە جموجۆڵ بووین، سەیری هەمووانمان دەکرد و سەرنجی هەڵسوکەوتی هەمووانمان دەدا پێموایە ئەوە لە سروشتی ئێمەدا بوو.

بولگارییەکان بێ کێشە بوون، کاری خۆیان دەکرد و دەڕۆیشتن، زیانیان بۆمان نەبوو، کە لە غوربەتی نەک تەنها هاونەتەوە دڵخۆشت دەکات، بەڵکو خەڵکی نەتەوەی دراوسێشت دڵنەواییە بۆت. یەکێک لە قوتابییەکان کچێکی سووری بوو، چونکە هاوسێی وڵاتمان بوو، دڵمان پێی خۆش بوو و بووە هاوڕێ لەگەڵمان.

ئیدی بەم جۆرە بە هەموو جیاوازییەکانمانەوە بەیەکەوە جوان بووین و لە کولتووری هەر وڵاتێکەوە شتێک فێربووین.

دوای دوو هەفتە لە تەواوبوونی زمان، گەشتێکمان ئەنجام دا بۆ وڵاتی فەڕەنسا، کە زۆر نزیک بوو لە زاربرۆکن، ئەو شارەی لێی دەماینەوە، لە هەمان ڕۆژ چوین و گەڕاینەوە!

لە کوردستان ئەوکات لە شارێک بچوویتایەتە شارێکی تر، بە چەند خاڵی پشکنیندا دەڕۆیشتیت و ڕادەوەستێندرایت و کاتی زۆرت لێ دەڕۆیشت، زۆر لامان سەیر بوو لە وڵاتێکەوە چووینە وڵاتێکی تر، بێ هیچ خاڵی پشکنین.

ئیدی وردە وردە باشتر فێری زمانەکە دەبووین و کۆرسەکەمان تەواو کرد و پێویستی دەکرد لە بانکەکانیان هەژماری بانکی تایبەت بە خۆمانمان هەبێ.

کاتێ چوونە بانک، کارمەندەکان زۆر بە ڕوویەکی خۆشەوە مامەڵەیان لەگەڵ کردین، هەرچەندە دەشیان زانی کە خەڵکی خۆرهەڵاتین. بە لام ڕێزیان لێ گرتین و هاوکارییان کردین.

ئێمە وامان بیستبوو کە ئەڵمان ڕەگەزپەرست و خۆپەرستن، بەڵام کاتێ هەڵسوکەوت دەکەن، وەک مرۆڤێکی بەڕێز سەیرت دەکەن و سوکایەتیت پێ ناکەن.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەو کاتەم بەبیر هاتەوە کە چۆن لە وڵاتی ئوردن بە بێڕێزی و چاوێکی کەمەوە مامەڵەیان لەگەڵ کردین، لەوێ بەشێوەیەکی بەرچاو گرنگیت پێنادەن و کارەکان بە زۆری ڕادەپەڕێنن، هەرچەندە ئەوە شتێکی ڕێژەییە و هەردوو جۆر لە هەموو نەتەوەیەکدا هەیە.

بە هەرحاڵ بەهۆی ئەوەی زمانمان باشتر ببوو، بازاڕیکردنمان ئاسنتر بوو، بەڵام هێشتا سیفەتی زیادەڕەویمان تێدا مابوو، لە بازارکردن زۆرمان شت دەکڕی، خواردنی زۆر، کەلوپەلی زۆر، بەشێوەیەکی گشتی سێ بەقەد ئەوەی پێویستمان بوو دەمانکڕی، جارێکیان خاوەن ماڵەکە شتەکانی بینی و سەری سوورمابوو کە چۆن ئەو هەموو شتەمان کڕیوە، لای ئەوان بەگوێرەی پێویستییە، نە کەمتر نە زیاتر.

نەک تەنها لە بازاڕیکردن، بەڵکو لە ئاو و کارەباشەوە، گڵۆپی زیاد پێ ناکەن، ئاوی زیاد بەکارناهێنن، ئێمە وەک ئەوەی کە لە کوردستان بەشێکی زۆری خەڵکی دەیکا، دەمانکرد، زیادەڕەوی زۆر.

سکاڵای لای دکتۆر نیهاد کردبوو لێمان، کە گوایە ئاو و کارەبای زۆر بەکاردەهێنین.

تەنانەت لە کاتی ئامادەکردنی چێشت، هەوڵیان دەدا کەمترین شت پیس بکەن، بۆ ئەوەی ئاوی زۆر بەکارنەهێنن، یاخود کاتێ کە پێویستییان بە ژوورێک، جێگایەک نییە، ڕووناککەرەوەکان داناگیرسێنن.

ئیدی وردە وردە ئەو ئەخلاقیاتە جوانە کە لە ژیانی ڕۆژانەیان بەکاریان دەهێنا، ئێمەیش پێمان ڕاست بوو و وردەوردە دەمانویست لە ژیان و ڕۆتینی ڕۆژانەمان شوێنی بۆ بکەینەوە و بیکەینە خوویەکی خۆمان.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## ژیان لەگەڵ کولتوورێکی نوێ و پڕ لە جیاوازی

ژیان بە جیاوازییەکانەوە جوانە، چی لەبەردەکەی، چی دەپۆشیت؟ ڕەنگی پێستت چۆنە؟ چ ئایینێکیت؟ سەر بە چ نەتەوەیەکیت؟ ڕیش و قژت چۆن چاک دەکەی؟ بێدەنگی یاخود قسە دەکەی؟ ئەوانە پەیوەندی بە هیچکامێکمانەوە نییە، کاریگەری لەسەر ژیانی کەسمان نییە، مرۆڤ ئازادە چی دەکات و چۆن دەژی، بە مەرجێک لەسەر حسابی ژیانی کەس نەبێ و زەرەر بە کەسانی دەووروبەری نەگەیەنێت.

سەرەتاکان لە کۆرسی زمان، کوڕێکی بولگاریمان لەگەڵ بوو، قژێکی دەستکردی سەیری لەسەر بوو، زۆر جار دەمانکردە گاڵتە و پێی پێدەکەنین، یان دەمانگوت چۆنە ئیستا پرچی بۆ نەبڕین و وەکو خۆمانی لێ نەکەین؟ مەبەستمان ئەزیەتدانی نەبوو، بەڵام بەو نموونە دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە مرۆڤ قابیلی قبووڵکردنی جیاوازییەکانە، بە نموونە ئەو کوڕە شێوە و شکڵی هەرچۆنێک بووبێت، کەسێکی بەڕەوشت و بەڕێز بوو، لەگەڵ ئەوەدا ڕووخۆشیش بوو لەگەڵمان، خۆی هەر ئاگاداری ئەو بیرانەی ئێمەیش نەبوو، بەڵام ئیدی قبووڵکردنی یەکتر بە هەموو جیاوازییەکانەوە، کرۆکی پێکەوەژیان و گونجاندنە. پێویستە هەندێکمان لە هەندێکمان جیاواز بین، بۆ ئەوەی هەموومان بەجوانی دەریکەوین، جوانی نەتەوەیی و بیر و عەقل و شکڵ و شێوە. ئیدی وردە وردە ئێمەیش لەگەڵ جیاوازییەکان دەژیاین و ڕاهاتین لەگەڵ کەس و نەتەوەی جیا ژیان بکەین.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

شتێکی تر من هەستم پێی کردبوو ئەوە بوو کەمی متمانەبەخۆبوون بوو لای تاکی کورد، خەڵکی وڵاتانی تر متمانەبەخۆبوونیان لە قسە و کردار و ڕەفتاریاناندا ڕەنگی دابوویەوە، ئێمە شتێکمان هەبوو هەستمان بە کەمتر لەوان دەکرد. بەهۆی گەورەبوونمان و پەروەردەبوونمان لە ناو سیستەمی وڵاتێکی دیکتاتۆری حوکمڕانیدا، ئەو هەستە لەلامان گەڵاڵە ببوو کە کەمتر بتوانین بۆ مافی خۆمان قسە بکەین و بێینە دەنگ. زیاتر بەرامبەر ئەو هاوڵاتییانەی کە لە وڵاتی خۆیان زۆر ڕێزلێگیراو بوون، هەستمان بەو جیاوازییە دەکرد.

پێموایە ئەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە بنەڕەتەوە هەستی شایەن بوونمان پێ نەبەخشرابوو، نەتەوەکەمان بەگشتی تووشی کپبوون هاتبوون، سەرەتاییترین ماف کە بێدەنگ نەبوونە بۆ حەقی خۆت، نەمانبوو. ژیان لەناو سیستەمێکی دیکتاتۆری ئەوە لە ناخی هەر تاکێک دروست دەکات بێ ئەوەی هەستی پێ بکات.

جیاوازییەکە کاتێ وەدەر دەکەوێ کە مرۆڤ هۆشیارانە لەناو چین و نەتەوەیەک و سیستەمێکی دیموکرات و ئازادانەدا دەژێیت. هەر تاکێک ئازادانە و ئازایانە گەورە بوو، سڵ لە هیچ شتێک ناکاتەوە و خۆی بە شایەنی هەموو مافە سەرەتییەکانی خۆی دەزانێ و وە دەنگ دێ بۆیان. لە ناخیشەوە میتمانەیەکی زۆری بەخۆی دەبێت و ئەوەیش لە هەموو هەڵسوکەوتێکی ڕۆژانەیدا ڕەنگ دەداتەوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## دکتۆر نیهاد و ڕۆڵی گرینگ

پێشــووتریش ئامــاژەم بــە گرینگی ڕۆڵــی دکتــۆر نیهــاد دا لــە ســەرەتاکانی هاتنمــان بــۆ ئەڵمانیــا و دەســتپێکردنی کۆرســی زمــان. شــایەنی باســە کــە ناســینی د. نیهــاد پڕســوود بوو بۆمــان، هــەم لەڕووی ڕاپەڕاندنــی کارمــان، هــەم لــەڕووی شــیکردنەوە و تێگەیشــتن لــەو شــۆکە کولتوورییــەی کــە تووشــی بوویــن (culture shook).

شــۆکی کولتــووری مەبەســتم ئــەو گۆڕانکارییــە زۆرەیــە کــە ڕووبــەڕووی بووینــەوە لــەڕووی ژینگــەی دەوروبــەر و کەســەکان و شــێوازی ژیــان بەگشــتی.

بەشــێوەیەکی گشــتی هــەر مرۆڤێــک لــە کولتوورێکــەوە بچێتــە کولتوورێکــی تــرەوە، تووشــی ئــەو سەرســامییە دەبێــت و کاتــی دەوێــت تــا لەگەڵــی ڕادێــت، گۆڕانــکاری بەســەر هەمــوو ئــەو شــتانەدا دێ کــە پێشــووتر لــەلات بــاش بــووە یــان خــراپ، ڕاســت یــان هەڵــە، ئــەو گۆڕانکارییــە ڕەنگــە لــە وڵاتێکــی ئەوروپییــەوە بــۆ وڵاتێکــی تــری ئەوروپی زۆر نەبێت، بــەڵام لە وڵاتێکی خۆرهەڵاتــی ناوەڕاست، وەک عێــراق، بــۆ وڵاتێکــی ئەوروپــی وەک ئەڵمانیــا، یەکجــار زۆرە.

دکتــۆر نیهــاد لــەو خاڵــەدا زۆر هاوکارمــان بــوو، ئەگــەر بــە چەنــد دێڕێــک باســی نەکــەم ویژدانــم ئاســوودە نابێــت.

خــۆی خەڵکــی شــاری هەولێــر بــوو و خوێندنــی لــە بەغــدا تــەواو کردبــوو، کــە ســەفەری کردبــوو بــۆ ئەڵمانیــا دانیــان بــە بڕوانامــەکای

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دا نەنابوو، بۆیە ناچار بوو زۆر کاری زەحمەت بکات لە پێناو ژیانی و دواتر بە چەندین وێستگەی تردا ڕۆشتووە و پێگەیشتووە، ئێستا ئەو لە باشترین دکتۆرەکانی ئەڵمانیا و ئەوروپایە لە بواری نەشتەرگەری، ژیانێکی ئاسوودە و ئارامی هەیە.

چونکە بە زۆر قۆناغی زەحمەت ڕۆشتبوو، ئێمە وەک برایەکی گەورە سەیرمان دەکرد و لە بەشێکی زۆری کارە سەرەتاییەکانمان ڕاوێژمان پێی دەکرد، بێگومان ئەویش لە باشی و خەمخۆری خۆی بوو کەوا مامەڵەی لەگەڵمان دەکرد.

جارێکیان ڕێنمایی کردین کە لەبری ئەوەی بە پاس بچینە زانکۆ (بۆماوەی ٥ خولەک) بەپێ بڕۆینە زانکۆ، مەودای نێوان ماڵمان و زانکۆ ٢٠ خولەک بوو ڕێگەیەکی خۆش بەناو دارستانێکدا دەڕۆیشت، یەکەم جار بزربووین، یەک کاتژمێرمان پێچوو تا گەیشتینەوە شەقامی سەرەکی، قاچمان هەمووی هەڵئاوسابوو، زۆر بە پێ ڕۆیشتبووین، بەڵام دواتر شارەزا بووین و ڕۆژانە وەکو وەرزشێک بە ناو ئەو سەوزاییە و هەوا پاکەدا دەڕۆیشتینە زانکۆ، تەنها زووتر لەخەو هەڵدەستاین، بۆ ئەوەی لەم هەوا پاکەدا و بەم بەیانییە بەدەم پیاسەیەکی خۆشەوە بچینە زانکۆ.

یەکێ لەو هاوڕێیانەی لەگەڵمان بوو، دواتر ڕۆشتبووە ماڵی خاڵی لە شارێکی تری ئەڵمانیا، قاچەکانی ئەوەندە هەڵئاوسابوون، خاڵی بە پێکەنینەوە پێی گووتبوو، ڕۆڵە گیان ئەوە بە قاچاغ هاتووی، یان بە فڕۆکە؟ ئەو قاچانەت بۆ ئاوها هەڵئاوساون؟ ئیدی ئەوەش یادگارییەکی خۆش بوو.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## سیستەمی بانکی و کاریگەری پارە

سیستەمی کارکردن بە پارە لە ئەڵمانیا وەک لای خۆمان نەبوو، ئێمە پارەمان بە دەست دەژمارد و هەمیشە لەگەڵمان بوو، لەناو گیرفانمان بوو، ئەوان سیستەمی بانکیان هەبوو، پارەکانت لەناو کارت بوون و لە دەرەوە تەنها کارتەکەت بەکاردەهێنا لەگەڵ ژمارە نهێنیەکەی ئەو سیستەمە.

ئەم جۆرە مامەڵەکردنە لەگەڵ پارە بۆ ئێمە نوێ بوو، لە وڵاتی خۆمان پارە لە دەستمانە و دەبیندرێ، لەوێ لەلات نەبوو ڕاستەوخۆ لەڕووی دەرونییەوە کاریگەری هەبوو لەسەرمان، تەنها بۆ کاری گرینگ بەکارت دەهێنا، لەڕووی تەندروستییەوە زۆر خاوێنترە، لەڕووی بەرکەوتنی ڤایرۆس و میکرۆبەوە.

## گرینگی کات و ڕازاوەیی و خاوێنی شار

زۆر سەرسامی گرینگیپێدانی ئەوان بووم بە کات و وردی هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیان، بۆنموونە تابلۆیەک هەیە لە پێشەوەی هەر پاسێک، خشتەی کاتی هاتن و چوونی پاسەکانی تێدا دەنووسرێ و بەشێوەی ئەلیکترۆنی، دەکرێ لە ئینتەرنێت بزانی چ کاتێک کامە پاس دەگاتە شوێنی مەبەست.

هەموو کات ئەم پاسانە لە کاتی دیاریکراوی خۆیان دەگەیشتن، پێوستی نەدەکرد لەشوێنی وەستان تۆ چاوەرێ بکەی لەکاتی ساردی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

و گەرمیدا، هەرئەوەندە لە ماڵی خۆتەوە بگەیتە شوێنی وەستانی پاسەکە، ئیدی لەکاتی خۆی ئامادە دەبوو.

هەستێکی خۆشە کاتێک دەبینی هەموو شتێک سیستەمە، مرۆڤەکان پابەندن و ڕێز لە کات دەگرن، بەم جۆرە کاتت بەفیڕۆ ناچێ لە کاتی مەبەست دەگەیتە کاری مەبەست.

یەکێکی تر لەو شتانەی کە لێیان ورد دەبوومەوە، ڕۆژانە کە بە پاس یان بەپێ هاتوچۆم دەکرد، خاوێنی شارەکە بوو، دروستکردنی شوێنی دڵگیر و جوان لەناو شەقامەکاندا، سیمایەکی جوانی بە شارەکە بەخشیوە.

هاوکاری خەڵکەکە بۆ پیس نەکردنی شارەکە، دیوێکی تری زۆر جوان بوو کە کەمتر لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەبیندرا، تەنانەت زۆر بە دەگمەن کاغەز و پیسیت لەسەر شەقام و شۆستەکان دەبینی.

دانیشتووانی ئەو شارە و ئەڵمانیا بە گشتی، خووی ئەوەیان هەیە کە بەیانییان زوو لە خەو هەڵدەستن، نموونەیەکم لەیاد ماوە، کاتێ بەیانییەک زوو، کابرایەکی تەمەن ٧٠ساڵی لە باخچەکەی خەریکی کارکردن بوو، یاخود دەرگا و پەرژینی باخچەکانیان بۆیە دەکردەوە.

ئەو چالاکبوونەی تاکی ئەڵمانی بەرهەمی ڕۆژێک و مانگێک نەبوو، بەڵکو ببووە خوویەکی هەمیشەیی لەلایان، ئەوە یەکێکە لە هۆکاری سەرەکییەکانی پێشکەوتنی هەمیشەیی کۆمەڵگاکەیان.

هەستی غەریبی و بیرکردنی ماڵەوەش؛ دایک، باوک، خوشک و برا شتێک بوو زوو زوو هەستمان پێی دەکرد، ناوەناوە لە ڕێگەی سکایپەوە قسەمان لەگەڵ دەکردن، یاخود لە ڕێگەی نامە ناردنەوە، ئەوکات وەک ئێستا نەبوو لە فرۆکەخانەوە بۆ هەولێر گەشت بکەیت، زوو زوو ئەو هەستەمان بۆ دەهات، بەڵام ئامانجەکەمان پاڵنەر بوو بۆ دان بەخۆ داگرتنمان.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## کارکردن وەک پزیشکێک لە نەخۆشخانەکانی ئەڵمانیا

مانگێک پێش ئەوەی کۆرسی زمان تەواو بێت، لەگەڵ دکتۆر نیهاد سەردانی بەرپرسی ئەو بەشەمان کرد کە بەنیاز بووە لێی دەست پێ بکەم لەسەرەتاکانی چونم بۆ ئەڵمانیا سەردانم کردبوو، ئەوکات بە زمانی ئینگلیزی لەگەڵی قسەم دەکرد، بەڵام سەردانی ئەمجارە بە ئەڵمانی قسەم لەگەڵی کرد، خۆم پێناساند زۆر سەرسام بوو بە فێربوونی زمانەکە و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و پێی وتم کەسی وا هەیە دوو سێ ساڵە لێرە دەژی بەو جۆرەی تۆش بەباشی فێرنابێ. ئەوەم زۆر پێ خۆش بوو، ئەویش هەمان ڕای منی هەبوو پێی وابوو ئێستاکە دەتوانم بە ئەڵمانی قسە بکەم و بنووسم و بخوێنمەوە. واتا دەتوانم پەیوەندی لەگەڵ نەخۆش بگرم، بۆیە پێی گونجاو بوو لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی زارلویس -DRK- دەست بە کارکردن بکەم.

نەخۆشخانەی زارلویس-DRK

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سەرەتا بە شێوەیەکی کاتی شوێنێکی مانەوەم لە نەخۆشخانە وەرگرت، تاکو شوقە/ خانوویێک بەکرێ دەگرم بۆ مانەوەم، ژیانێکی تازە و قۆناغێکی تازەم دەست پێ کرد و هەموو ڕۆژێک لە شەممە تاکو هەینی دەوامم هەبوو، لە کاتژمێر ٧:٣٠ دەبوو لە ناو نەخۆشخانە بام و جلی کارکردنم پۆشیبا و ئامادەبووبام بۆ کارکردن.

گرینگ بوو زۆر پەیوەست بیت بە کاتەوە، وەک وتم پابەند نەبوونت بە کاتەوە وەک دزینی شتکی گرینگی ئەوان وابوو. لەڕوانگەی ئەوانەوە کەسێک نەتوانێ پابەند بێت بە کاتەوە، ئەوا مرۆڤێکی دواکەوتووە.

کاتێک کە ڕۆیشتمە نەخۆشخانە، سەرۆک بەشەکە منی بە کارمەند و پەرستارەکان ناساند، لەو بەشەی لێی بووم هەموو جۆرە نەخۆشیێکی لێ بوو، بەتایبەت ئەوانەی پەیوەستبوون بە نۆبەی مێشک و نەخۆشییەکانی قۆڵۆن و گەدە و نازووری گەدە.

پێم وابوو سەرۆک بەشەکەم لەسەرەتاوە وای دانابوو من دوای دەستبەکاربوونم بچم پسپۆڕی ورد بخوێنم بۆ نەخۆشییەکانی هەناو و نەخۆشییەکانی گەدە و قۆڵۆن و نازوری گەدە، بەڵام من لە سەرەتادا هاتبووم ئەزموونی کارکردن پەیدابکەم لە بەشی هەناو و دواتر پسپۆڕی لە بەشی نەخۆشییەکانی دڵ ورد بخوێنم، ئەو بەشەی کە لە زووەوە خولیا و ویستم بۆی هەبوو.

لە کۆرسی زمانەکە ئێمە زیاتر هەڵسوکەوتمان لەگەڵ کەسی بیانی بوو، تەنها بۆ کاری بانک و بازاڕ و هەندێ شوێنی پێوست ڕاستەوخۆ لەگەڵ کەسی ئەڵمانی پەیوەندیمان هەبووە.

بەڵام کاتێک دەستمان بە دەوام کردن کرد، لە بەیانی تا وەکو ئێوارە لەگەڵ نەخۆشی ئەڵمانی بووین و زیاتر قسەمان بە ئەڵمانی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەکرد، زۆرتر مومارەسەی زمانەکەمان دەکرد، ئەوە وای کرد بە ماوەیەکی کەم قۆناغێکی تری زمان ببڕین و بە زمانی نەخۆش قسەیان لەگەڵ بکەین و لێمان تێبگەن و لێیان تێبگەین.

خۆم بەو پەرستارانە ناساند کە لەو بەشە لەگەڵیان کارم دەکرد، هەرچەندە بەرپرسی پەرستارەکان لە سەیرکردنەکانی پێنەدەچوو زۆر خۆشی لێم هاتبێ.

ئافرەتێکی بەتەمەن بوو، زۆر کاری لێ زەحمەتکردم، خۆشی لێم نەدەهات، بەڵام تەنها ماوەیەک لەو ڕەدهەیە مامەوە دواتر ڕەدهەکەم گۆڕی.

ڕەنگە هۆکاری کەیف پێنەهاتنی ئەو پەرستارە و بەشێکی تری خەڵکی ئەوە بووبێ کە ئێمە لە عێراق هاتووین، کە بە وڵاتێکی شەڕانگێز و پڕ لە تۆقێن ناسرابوو، خەڵکی وا هەبوو کە دەیانزانی لە شوێنێکی واوە هاتووین، لێت دەتۆقین و وایان دەزانی کە هەرکەس لەوێوە هاتبێت شەڕانگێزە و مرۆڤێکی باش نییە.

جارێکیان نەخۆشێک لێی پرسیم کە خەڵکی کوێم، منیش بە دەنگێکی دیارەوە وتم عێراق، نەخۆشەکە پێکەنی و بە هێمنی وتی باشترە لەسەرخۆتر ناوی ئەو شوێنە بهێنی کە لێوەی هاتووی.

ئەڵمانەکان زۆر لە قسە و هەڵسوکەوت و کردار و گوفتاری کەسی بەرانبەر ورددەبوونەوە و دەیانخوێندەوە و لێی دەگەیشتن و بەو جۆرە مامەڵەیان دەکرد.

هەر ئەوەی کە بەم ساڵانەی کۆتایی لە شێوەی خول و کتێبەوە هاتە ناو کوردستان ئاماژە بۆ تێگەیشتن لە زمانی جەستە و گەشەپێدانی مرۆیی دەدات، کەچی ئەڵمانییەکان لە باوک و باپیرانیانەوە بەو جۆرە لە مرۆڤەکان دەڕوانن.

ئەوان بەشێوەیەکی گشتی وریا و زیتەڵ بوون و هۆشیار بوون

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

و بە زیرەکییەوە مامەڵەیان دەکرد و عەقڵ سەنتەر بوون، تێکەڵاوی کولتووری ئەوەی جوانە کە تۆ شتگەلێک لەوانەوە فێردەبی و ئەوانیش شتگەلێک لە تۆوە فێردەبن.

ئێمە و خەڵکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، بە حوکمی ئەوەی ستەم و زەحمەتی زۆرمان بینیوە، لایەنی سۆزداریمان زیاتر لە سەرەوەیە، بۆیە لە بابەتی هەست و هەستکردن بە کەسی بەرامبەر و بەو کەسانەی ستەمیان لێ دەکرێ، ڕەنگە باشتر بووبین و ئەوان لە ئێمەوە لەو خاڵەدا شتمان لێ فێربووبن.

ڕۆژانە سەردانی نەخۆشخانەکانمان دەکرد، زۆر بەوردی لە هەڵسوکەوتی دکتۆرەکان لەگەڵ نەخۆشەکان ورددەبوومەوە، سیستەمێکی تۆکمە و یەکسان وەک یەک بۆ هەمووان، بەمانای وشە سیستەمێک بۆ خزمەتی نەخۆش، دواتر زۆر بە وردی باسی دەکەم و نموونەی جوانیان لەسەر دێنمەوە.

## یەک بۆ هەمووان هەمووان بۆ یەک

فەیلەسووفێکی ئەڵمانی بەناوی Otlo Bismark خاوەنی ئەو قسەیەی سەرەوەیە، ئەوە فەلسەفەی سیستەمی تەندروستی ئەڵمانیا بوو.

یەک سیستەمی تەواو و تۆکمە و یەکسان بۆ هەمووان وەک یەک بێ جیاوازی، لەهەمان کاتدا هەموو ئەو سیستەم و پێداویستی و ستاف و کارمەندانە بۆ خزمەتی یەک نەخۆش. گەنجان پارەی بیمەی تەندروستی دەدەن بۆ پەککەوتە و خاوەن پێویستییەکانی ئەمڕۆ، دواتر نەوەکانی تر بیمەی تەندروستی دەدەن بۆ ئەوانەی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کە ڕۆژێک لە ڕۆژان گەنج بوون و پارەیان بۆ کەسانی خاوەن پێویست داناوە.

بەم جۆرە هەر دەمە و نەوەیەک پارە بۆ نەوەیەک دادەنێ، دواتر نەوەکانی تر بیمەی تەندروستی بۆ ئەوانی تر دادەنێن. بەڕاستی جوانە کاتێک بە یەکسانی وەک یەک بۆ هەموو نەخۆشێک خزمەت پێشکەش بکە.

پێم خۆشە تیشک بخەمە سەر تۆکمەیی سیستەمی تەندروستی و دواتر بەراوردکردنێک بکەم لەگەڵ ئەو سیستەمەی کە لێرە هەمان بووە و تا ئێستاش هەمانە و بەردەوامە، بۆ مەبەستی سوود لێ وەرگرتن و جێبەجێکردنی، نەوەک بۆ شکاندن یان لەکەدارکردنی.

سیستەمەکە چونکە هەموو مرۆڤێک پێی خۆشە، خاوەنی باشترین وڵات بێیت و باشترین خزمەت فەراهەم بکات بۆ هاونیشتیمانیانی.

بابەتی باسکردنی سیستەمی سەرکەوتوویی وڵاتانی تریش ئەزموونێکە و بینیومانە و دڵنیام بەشێکی زۆری ئەو پزیشکانەی ڕۆیشتونەتە دەرەوەی وڵات، هەمان شتیان بینیوە و هیواخوازن هەمان شت بۆ نەخۆشەکانی خۆمان بکرێ، بەڵام هەموو کەس چەندیەتی هەڵەکانی بەشێکە لە بەرەوپێشچوون بۆ باشترکردنی گۆڕانکاری.

هەموو سیستەمێکی سەرکەوتوو پێوستی بە سێ سێکتەر هەیە:

١- نەخۆشخانە و پێداویستی تەواو بە کوالیتی بە هەبوونی ئامێری پێویست.

٢- دکتۆر و ستافی کارامە و زیرەک و ماندوونەناس.

٣- هۆشیاریی تەندروستی لەلایەن نەخۆشەکان و تاکەکانی کۆمەڵگا.

کاتێک ئەم سێ تەوەرەیە دەگەنە یەک، باشترین و سەرکەوتووترین سیستەم دێتە بوون، نەخۆش زۆرترین سوود

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

وەردەگری، پزیشک و ستافی نەخۆشخانەکانیش باشترین کوالیتی پیشکەش دەکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لایەنی هۆشیاریی نەخۆش لە ئاستێکدابیت بتوانی لێت تێبگات کاتێک کە شتێکی بۆ باس دەکەیت، یان پێویستت بەم پشکنینانە هەیە.

لە ئەڵمانیا و زۆرێک لە ولاتانی دونیا، پەیڕەوی سیستەمی بیمەی تەندروستی دەکری، (التأمين الصحي) بەو واتایەی مانگانە بڕێک پارە لە مووچەی هەر تاکێک دەگیرێتەوە و دەخرێتە سەر حسابی تەندروستییان، هەر کاتێک و هەر ڕۆژێک تووشی هەر چییەک بوون، لە نەخۆشخانە هەموو شتێکیان بۆ دەکری و سیستەمی تەندروستی تێچووەکەی لەخۆ دەگرن.

ئەوەش لە رێگەی ئەو برە پارەی کە مانگانە جیا دەکرێتەوە بۆ تێچووی تەندروستی هەر تاکێک، پارە ڕاستەوخۆ لە نێوان نەخۆش و دکتۆردا بوونی نییە، دکتۆر چی بڕیار بدات نەخۆشەکە کێشەی نییە، بێگومان دکتۆر گۆڕین و ڕاڕایی نییە. بۆنموونە کاتێک دکتۆرێک بە نەخۆشێک دەڵێت حاڵەتەکە ئاوایە و چارەسەرەکەی بەم جۆرەیە، نەخۆشەکە ناچار نییە ٥ تا ٦ دکتۆری تر بگەڕێ و ڕا و بۆچوونی هەمووان وەربگری، بێگومان ڕاوێژکردن خراپ نییە، بەلام زیادەڕۆیی لە ڕاوێژکردن دەبێتە هۆی قەلەقی و ڕاڕایی و نەخۆش لە نێوانیان دەمێنێتەوە.

لێرە لە کوردستان ئەو شتە زۆر بوونی هەبوو، پێم وایە هۆکارەکەشی نەبوونی متمانە بوو لەنێوان نەخۆش و دکتۆر، کاتێک کە پزیشک پشکنین دەنووسی، هەندێک نەخۆش متمانەی نییە کە ئەوە شتێکی پێوستە و لە بەرژەوندی ئەوە، هەست دەکات زیادە، بۆیە لە ڕووی دەروونییەوە ئارام نابێت و سەردانی چەندین

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دکتۆری تر دەکات، بەم شێوەیە کات و وزەی نەخۆش و دکتۆر زۆر دەڕوات و کەسیان ناگەنە ئەنجامێکی دیار. بۆیە ڕاست کردنەوە و دانانی سیستەمێکی هاوشێوە، بەشێکی زۆر لە کێشەکان چارەسەر دەکات، هیواخوازین بتوانین سیستەمێکی تۆکمە و بێ کێشە لە کوردستان پەیڕەو بکەین، چونکە تا سیستەم نەبێت، کارەکان بەجوانی ڕاناپەڕێندرێت.

دیاردەیەکی باو هەیە لە کوردستان کە خودی کارەکە جوانە و مایەی شانازییە کە هاونیشتمانیان کاری وا دەکەن، ئەویش دیاردەی کردنەوە و دانانی نەخۆشخانەی خێرخوازییە. خۆی ئامانجەکەی یارمەتیدانی نەخۆشە، بەڵام پیشەی پزیشکی بە خێر و خێرخوازی بەڕێوە ناچێت، چونکە ژمارەکە زۆرە و ئەوە چارەسەری بنەڕەتی نییە. ئەگەر نا هاوکاریکردنی کەسی کەمدەرامەت کارێکی زۆر مرۆڤانەیە، بەڵام کرۆکی قسەکەی ئێمە ئەوەیە لە بنەڕەتەوە هەموو شتێک چارەسەر بکرێت و بۆ هەمووان هەموو شت بەیەکسانی فەراهەم بکرێ.

لە باشییەکانی سیستەمی بیمەی تەندروستی ئەوەیە کە کاتێ هەر تاکێک مانگانە بڕێک لە مووچەکەی بۆ بیمەی تەندروستی دەچێت، مەرج نییە خۆی لەو مانگەدا پێویستی پێی بێت، بەڵکو ڕەنگە بڕی پارەی هەمووان کە پێویستیان پێی نییە، بۆ ئەو نەخۆشانە بچێت کە پێویستیانە، دواتر مانگەکانی تریش بە هەمان شێوە، پارەی هەمووان بۆ ئەو کەسە دەچێت کە پێویستی پێی هەیە. ئەوەش واتایەکی تری یەک بۆ هەمووان، هەمووان بۆ یەک.

لە درێژەی کارکردنم لە نەخۆشخانەکان، ڕۆژانە فێری چۆنیەتی کارکردن لەسەر شێوازی سیستەمی ئەوان دەبووم، یارمەتیان دەدام بۆ فێربوونم، بەڵام هەرگیز لەبری من کارەکانیان نەدەکرد،

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەر کەس تەنها ئەو کارەی دەکرد کە لە ئەستۆی بوو.

لەو ڕەدهەیەی کە دەوامم لێی دەکرد ئێمە چوار دکتۆر بووین، هەریەکێکمان کۆمەڵە نەخۆشێکمان هەبوو، کارەکانی ئەو نەخۆشانە لە ئەستۆی دکتۆرەکە بوو، بۆنموونە ئامادەکردن و چاودێریکردنی، یاخود خوێن لێ وەرگرتنی بۆ پشکنین (لەوێ ئەوە کاری دکتۆر بوو نەک پەرستار) هەروەها پڕکردنەوەی پەرەوەندی نەخۆش و چەندەها کاری تر، کە لە وڵاتی خۆمان دکتۆر نەیدەکرد، دواتر هەموو زانیارییەکانمان دەخستە سەر سیستەمی (DRG) تاوەکو پارەی بیمەی تەندروستی بچێتە سەر هەژماری نەخۆشخانە.

دواتر هەموو بە پاڵاوتنی بەپرسی بەشدا دەڕۆیشت و دەستکاری نەدەکرا. بەو واتایەی کاتێ نەخۆشێک دەهات تا دەردەچوو لە نەخۆشخانە، هەموو کارەکانی لە ئەستۆی پزیشک بوو، سەرەتا ژمارەی ئەو نەخۆشانەی بە منیان دا کەم بوون، لەبەر هۆکاری زمان، بەڵام دواتر وردەوردە زیادبوون بۆ ٤ بۆ ٥ نەخۆش.

جاری وا هەبوو کە دکتۆرێک پشوو، یاخود مۆڵەتی وەردەگرت، نەخۆشەکانی ئەویش دەکەوتە سەر ئێمە و کارەکانمان بۆیان دەکرد و پێڕادەگەیشتین.

سەرسامی چۆنیەتی هەڵسوکەوتیان بووم، هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵم بوون، نەدەیانهێشت شتێکی زیاد وەرگرم، نە دەیانهێشت لە قۆناغێک بمێنمەوە و تووشی بێزاری ببم، سەرۆک بەشەکەم خوێندنەوەیەکی باشی بۆ کردبووم، بەرپرسیارێتی دەدامێ، هەندێ ژمارەی نەخۆشەکانیان بۆم زیاد کرد، تا وای لێهات گەیشتە ١٢ نەخۆش.

دوای شەش مانگ، یەکێک لە دکتۆرەکانی ڕەدهەکەمان نەخۆش کەوت و یەکێکیش لە مۆڵەت بوو، ئیدی بەتەنها من مامەوە و

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەموو نەخۆشەکان لەسەر ئەستۆی من بوون و کارم بۆیان دەکرد.

حەتمەن مرۆڤ کە حەزی بە کارەکەی کرد و ماندوو بوو لە پێناوی، ئیدی ئەستەم نییە بگاتە هەر قۆناغێکی بەرز، سوپاس بۆ خوا بە هەوڵی ئەوان و شەونخوونی و ماندوبوونی خۆم، توانیومە بگەمە ئەو ئاستە.

نابێ رۆڵی سیستەمی رێک لەیاد بکەین، هەرکەسێک توانای باشی هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا لە سیستەمێکی تۆکمە و رێکدا کاری کرد، بێگومان دەگاتە ئاستێکی زۆر بەرز و هەستت بەبێزاری نەدەکرد.

خاڵێکی دیکە هەیە پێم خۆشە باسی بکەم، ئەوەی کاتێک نەخۆشێک پێوستی پێبایە دەبووا ئەو پزیشکەی کە لێی بەرپرسە، قسەی لەگەڵ خانەوادەی نەخۆشەکە کردبا، بۆ ئەمە کاتێکیان دادەنا بۆماوەی ١٥ بۆ٢٠ خوولەک، روونکردنەوەی پێویست دەربارەی نەخۆشەکە، پشکنینەکانی و دەرمانەکانی لەگەڵ رێنمایی پێویست بۆی، دواتر هەموو زانیارییەکان بە خواستی نەخۆش (طبلە) تۆمار دەکران.

لە کوردستان ئەو شێوازەم نەدیبوو، رەنگە ئەوەش بگەرێتەوە بۆ ئەزموونی سیستەم، لەوەیە دکتۆرێک چەندەها ئەرکی لەسەر شان بێت و نەتوانێت ئەرکەکان بەم جۆرە راپەرێنێت.

بەلام ئەگەر بێتوو کاتی تایبەت بۆ قسەکردن لەگەڵ خانەوادەی نەخۆش تەرخان بکرێت، ئەوا دڵنیایی و گرینگی دەدەی بە نەخۆشەکە، لەلایەنی دەروونیشەوە پشتگیرییە بۆی.

دوای ئەوەی نەخۆشێک لە نەخۆشخانە دەردەچوو، دەبووایە سەردانی بەشی کۆمەلایەتی (Social Department)ی نەخۆشخانەی بکردایە. پرسیاری ئەوەی لێدەکرا کە لە کوێ دەژی و لەگەڵ کێ

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەژی؟ ئایا کەسێک هەیە ڕۆژانە چاودێری بکات و ئاگاداری دەرمانەکانی بێت و لە نانخواردن و شۆردن و کاری ڕۆژانەی یارمەتی بدات؟

ئەوانەی ئەو کێشەیەیان نەبوو، بە شێوەیەکی دڵنیاییەوە دەنێردرانەوە ماڵەوە.

بەڵام ئەگەر هاتوو کەسێک بە تەنیا ژیابا، یاخود کەسێک نەبووایە خزمەتی بکات، ئەوە ئەرکی ئەم بەشەی نەخۆشخانە بوو کە بیگرێتە ئەستۆی خۆی.

لە هەندێ حاڵەتی پێویستدا پەرستارێک ڕۆژی جارێک یان زیاتر (بەپێی پێویست) دەنێردرایە ماڵی نەخۆشەکە و کارەکانی بۆ ڕادەپەڕاند، هەندێک جار خۆبەخشی تایبەت هەبوون بۆ ئەم کارە و ئامادەسازی تەواو دەکرا بۆی، بۆ ئەوەی بتوانێ خزمەتی باری تەندروستی نەخۆشەکە بکات لە ماڵەوە و کێشەی بۆ دروست نەبێت.

لە کوردستان بە حوکمی ئەوەی بازنەی کۆمەڵایەتی و خزمایەتی تۆکمەترە، بۆیە زۆربەی جار لەلایان کەسە نزیکەکانی نەخۆشەکەوە ئەم کارانە ئەنجام دەدرێ. بەڵام بێگوومان حاڵەتی ئاواشمان هەیە کە نەخۆش بێکەسە و پێویستی بە چاودێری وردە.

هیوا خوازین لە داهاتوودا بەشی هاوشێوە لە نەخۆشخانەکانی خۆشمان ببینین، بۆ ئەوەی دڵنیایی سەلامەتی باری تەندروستی نەخۆش بگرینە ئەستۆ و ئەو خزمەتەی لە نەخۆشخانە پێشکەشی کراوە لە ماڵەوەیش بۆی فەراهەم بکرێ.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

# سیستەمی پزیشکی خێزانی

سیستەمی کارکردنی پزیشکان دوو جۆر بوو، بەشێوەیەکی گشتی ئەو پزیشکانەی لە نەخۆشخانەکان دەوامیان دەکرد و لە ڕەدهەکان نەخۆشەکانیان دەبینی، لەگەڵ بەشێکی تر ئەوانەی لە نۆڕینگەکان نەخۆشیان دەبینی، پێم باشە باسی بەرپرسیارێتی پزیشکەکانی نۆڕینگە بکەم، کە بە پزیشکی خێزانی ناسرابوون. پزیشکەکە بەیانیان لە کاتژمێر ٨ تا ١٢:٣٠ نەخۆشەکانی دەبینی، هەموو بەشێوەیەکی ڕێک، لە کات و مەوعیدی خۆی، دواتر پشوویێک وەردەگرێت و لە کاتژمێر ٢ بۆ ٤:٣٠ دەستی بە دەوام دەکردەوە.

هەر پزیشکێک بەرپرس بوو لە ژمارەیەکی دیاریکراوی نەخۆش، زانیاری تەواوی لەسەر مێژووی نەخۆشەکەی هەبوو، یاخود ئەو پرۆسانەی بە خەواندن (داخیلبوون) دەبوو نەخۆشەکان لەلای پزیشکی خێزانی خۆیان دەبیندران لەڕێگەی نووسراوی فەرمییەوە لەلایەن دکتۆرەکەوە دەنێردرێنە نەخۆشخانە، هەندێ جار لەڕێگەی تەلەفوونەوە ئێمەیان ئاگادار دەکردەوە کە نەخۆشێک دێت.

دواتر دەهاتنە نەخۆشخانە، ئەوەی پێویست با ئەنجاممان دەدا، دواتر هەم لەڕێگەی نووسراوی فەرمییەوە وەڵاممان بۆ پزیشکی خێزانییەکە دەنارد و ئاگادارمان دەکردەوە لەوەی چی بۆ کراوە، بەم شێوەیە نەخۆش بزر نەدەبوو، بەو مانایەی لەڕێگەی یەک دوو دکتۆردا بزر نابێ و یەکێک دەبێ کە بە بەردەوامی ئاگای لە باری تەندروستی نەخۆشەکەیە.

لە کوردستان جاری وا هەیە نەخۆشێک لە نەخۆشخانە دکتۆرێک

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دەبینێت، دواتر ڕەوانەی بەشی ڕاوێژکارەکان دەکرێت و دکتۆرێکی تر دەیبینێت، جاری وا هەیە خۆی نەخۆشەکە سەردانی نۆڕینگەی یەک دوو دکتۆر دەکات، ئیدی بەم شێوەیە شێواوی و ناڕێکی دروست دەبێت لە پێدانی دەرمان و چاودێریکردنی، جیا لەوەی ئەم هەموو دکتۆرە قەلەقی دروست دەکات.

سالانە وەک ڕێزلێنانێک مەرسیمێک بۆ ئەم پزیشکانە ڕێکدەخرێ لە باخچەی نەخۆشخانە یەکترمان دەبینی و ژەمە نانێکمان بەیەکەوە دەخوارد، زیاتر بۆ مەبەستی لایەنی کۆمەڵایەتی پزیشکەکان بوو کە بەهەماهەنگی نەخۆشخانە و نۆڕینگەکان کاریان دەکرد.

## ڕۆڵی پەرستار

پەرستار ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی نەخۆشخانە و سیستەمی تەندروستی ئەڵمانیا. پەرستارەکان شارەزابوون، وریا و زیرەک کارەکان و بەرپرسیارێتییەکانیان ڕادەپەڕاند، بەشێوەیەکی گشتی زۆر شانازییان بە کارەکانی خۆیانەوە دەکرد، هەرگیز خۆیان بەکەم نەدەزانی.

زۆرجار وابوو ئەوان شتیان بۆ دکتۆرەکان ڕاست دەکردەوە و بەشێوەیەک پێیان دەوتن کە لەسەر نەفسیەتی هیچ کامیان ناخۆش نەبێت.

هەر بەگشتی ئەخلاقی کۆمەڵگای ئەڵمانی وایە، یان کاتێک هەڵەیەک لە کەسێک دەبینن، ڕەخنە دەگرن و دەیانەوێ ڕاستی بکەنەوە، بۆیە تاکی ئەڵمانی بە دکتۆر و پەرستار و هەموو کەسێک دەزانن، ئەگەر لەڕێ لابدات. بەگوێرەی سیستەم نەڕۆن

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەوا ڕووبەڕووی ڕەخنە دەبنەوە، بۆیە لە هەوڵدان بەگوێرەی توانا کەمترین هەڵە ئەنجام بدەن لەسەر هیچ ناحەقییەک بێدەنگ نابن، لەلایەن هەرکەسێکەوە ئەنجام بدرێت.

جارێکیان خوێنم لە نەخۆشێکم وەرگرتبوو قووتووی خوێنەکە و پێداوستییەکانم لەو شوێنە بەجێهێشت و لە شوێنی تایبەت بە خۆیانم دانەنابوو، دواتر ڕۆیشتم و دوای کاتژمێرێک گەڕامەوە، بینیم شتەکات لە شوێنی خۆیانن، لە پەرستارەکەم پرسی: بۆچی لێرەن و نەبردراوەنەتە تاقیگە و کاتەکەی درەنگ بووە؟ پەرستارەکە گوتی: دکتۆر شوان، شتەکانت لە شوێنی خۆیان دانەناوەتەوە، هەریەکیان شوێنی خۆی هەیە، نابێ بەو جۆرە بەجێیان بهێڵی. ئیدی داوای لێبووردنم کرد و نەمدەزانی بەو جۆرەیە، ئیتر فێربووم. بینیم پەرستارەکە شەرم ناکات لە گوتنی شتێک کە ڕاستییە، سیستەمێکی تایبەت هەیە و بۆ هەمووان وەک یەکە و لەسەری دەڕۆن، هەرکەسێکی تر هەڵەی کردبا، پەرستاری بەشەکە ئاگاداری دەکردەوە و پێی دەگوت کە ئەو ئیشەی نابێ بەو جۆرە بێت.

لە کوردستان ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەم نەبینیبوو، پەرستارەکان شەرم لە دکتۆرەکان دەکەن هەڵەیەکیان بۆ ڕاست بکەنەوە، بێگومان ئێستا هەڵسوکەوتی خەڵکی کوردستان زۆر گۆڕاوە و دڵنیام ڕێژەیەکی باش هەیە بە شێوەیەکی ئەخلاقی و تەندروست، هەڵە و کەموکورتی یەکتر چاک دەکەنەوە. لە هەموو کۆمەڵگایەکیش کەسی وای تێدایە کە هەوڵی شکاندنی بەرامبەری دەدات. گرینگ ئەوەیە بۆ خزمەتی نەخۆش کار بکەین.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ناوی بەشێک لەو پەرستارانەی لە ڕۆستۆک کارم لەگەڵیان کردبوو، لەکاتی جێهێشتنی ئەڵمانیا، لەڕێگەی ئەم نووسینەوە هیوای سەرکەوتن و بەردەوامییان بۆ خواستم

## مامەڵەکردنێکی زۆر نموونەیی

جارێکیان لەگەڵ سەرۆک بەشەکەم چووین سۆنەر بۆ نەخۆشێکی بەساڵاچوو بکەین، کە تەمەنی نزیکە ٩٠ ساڵ دەبوو، لەوێ دکتۆری ڕەدهە (بەشی هەناو) سۆنەری دەیکرد، نەک پسپۆری تیشک، منیش سەرەتابووم بۆئەوەی فێربم پەرستارەکە نەخۆشەکەی هێنا و داینا، سەرۆک بەشەکەم سۆنەری بۆ کرد، دوای ئەوەی کە تەواو بوو، قەت ئەوەم بیرناچێ کە نەخۆشەکەی دانیشاند و پێڵاوەکەی لەپێکرد و لەسەر عارەبانەکەی دانا و بردیەوە بۆ ژووری خۆی.

هەستێکی یەکجار سەیرم هەبوو، یەکەمجارم بوو پزیشک ببینم دابنەوێتەوە و خۆی بە دەستی خۆی پێڵاو لەپێی نەخۆشە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەساڵاچووەکەی بکات، لوتکەی خۆ بەکەم زانین و خاکیبوون بوو، وانەیەکی زۆر باشی فێرکردم، بێ ئەوەی دوو وشە قسەم بۆ بکات.

دەپرسم و ڕووم لە هەموو پزیشک و پەرستارێکە بەخۆشمەوە:

چەند جار کاری وامان بۆ دایە و بابە حاجییەکانمان ئەنجام داوە؟

چەند جار بەو جۆرە خاکییە یارمەتی دایە و بابە حاجییەکمان داوە؟

ئایا ئامادەین بێ هیچ شەرمێک کردارێکی لەو جۆرە بکەین؟ بەڕاستی ئەوە لوتکەی مرۆڤبوون بوو، لوتکەی مومارەسەکردنی پیشەی پزیشکی بوو، کە خزمەتکردنی نەخۆشە.

پەرستارەکانیش ڕۆژانە کاری لەو جۆرەیان ئەنجام دەدا، بەبێ فیزەوە خزمەتی نەخۆشەکانیان دەکرد بەتایبەت نەخۆشەکانی خانەی بەساڵاچووان، پەرستارەکان فڵچەی ددان و جلوبەرگ و ڕیش و پرچیان... هتد هەموویان بۆ پاک دەکردنەوە، یارمەتیان دەدان لەو ماوەیەی لە نەخۆشخانە دەمانەوە.

تاکی ئەڵمانی هەر کارێکی پێ بسپێردرێ بەباشترین شێوە ئەنجامی دەدات، زۆر بە جوانی و بێ کەمتەرخەمی، هەندێ جار لە دڵی خۆمەوە دەمگوت: بەڕاستی ئەو نەخۆشانە زۆر بەبەختن کە لە سیستەمێکی ئەوها، دکتۆر و پەرستاری لەو جۆرە خزمەتیان دەکەن.

ڕووی قەڵەمی من لە باشییەکانی تاک و سیستەمی ئەڵمانییە، بە حوکمی ئەوەی ئەزموونی کارکردن و ژیانم لەوێ بوو، ئەگەر نا ڕەنگە لە زۆر دەوڵەت هەمان ئاست، بگرە باشتریش پێشکەش بکرێ.

جارێکیان لە نەخۆشخانە ئێشکگر بووم، شەو درەنگ تەلەفوونیان

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بۆم کرد کە پێویستە بچم نەخۆشێک ببینم، ڕۆیشتمە لای و کاری پێویستی بۆ کرا، دواتر گوتی: دکتۆر ئەگەر لە کاتت ناگرم پێم خۆشە پرسیارێک بکەم، فەرمووم کرد و کاتم پێی دا، گوتی: خەڵکی چ وڵاتێکی؟ لە وەڵامدا وتم: خەڵکی کوردستانی عێراقم، بە سەر ئاماژەی کرد و گوتی: خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، دواتر گوتی: ئاساییە ئەگەر پرسیارێکی تریش بکەم، ئەگەر نەخۆشی تر چاوەڕێت ناکات، یان خۆت ماندوو نیت و لە کاتت ناگرم؟ زۆر لام سەیر بوو ئەو پیاوە پیرە بەو ئاستە زۆرەی ڕێزگرتنەوە قسە دەکات، نەمدیبوو نەخۆش ئەوەندە بە ڕێزەوە ڕێز لە کاتی پزیشکان بگرێت.

وتم: فەرموو بەڕێز، گوتی: باشە بۆچی خەڵکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەوەندە لەگەڵ یەک خراپن؟ لە بیرم نییە چۆنم وەڵام دایەوە، بەڵام لە ڕاستیدا خۆشم وەڵامی ئەو پرسیارەم نەدەزانی، بە ئێستایشەوە.

## هەڵسوکەوتی پیشەییانە

جارێکیان دوو دکتۆر بۆچوونی جیاوازیان هەبوو لەسەر نەخۆشێک، کە حاڵەتەکەی مەترسیدار بوو بەشێوەیەکی توند قسەیان لەگەڵ یەک دەکرد دەربارەی بۆچوونی خۆیان، زمانی جەستەی توندیان بەکاردەهێنا لە بەرامبەر یەکتری.

من لای خۆم پێم وابوو ئیتر هاوڕێیەتی یەکتر ناکەن و هەرگیز سڵاویش لەیەک ناکەن، بەڵام ڕۆژی دواتر بینیم زۆر ئاسایی قسە لەگەڵ یەک دەکەن و ڕوویان خۆشە بەرامبەر یەکتر، بۆم دەرکەوت کە زۆر گرینگە پزیشک هاوسەنگی بپارێزێ.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هەندێ ڕووداو هەن لەڕووی پزیشکییەوە ڕوودەدەن، پێویست ناکات تێکەڵی ژیانمان و پەیوەندییە کەسییەکانمانی بکەین.
بینیم کە مامەڵەکردنی ئەوان لەسەر بنەمای عەقڵە و هەست و سۆز تێکەڵ ناکەن، هەرکەس بۆ خۆی دەژی، زۆر شت لێک نادەنەوە ،هەرکەس لەسەر بۆچوونی خۆیەتی.

## ڕاشکاوی دکتۆر لەگەڵ نەخۆش

یەکێک لە نەخۆشەکانمان کە تووشی شێرپەنجەی قوڵۆن هاتبوو لە قاوشی ئێمە خەوێندرابوو، نەخۆشییەکەی تەشەنەی کردبوو، بەشێوەیەکی گشتی تەندروستی باش نەبوو، نەخۆشەکە تەمەنی٤٢ ساڵ بوو، بەرپرسی بەشەکەمان زۆر بە ڕاشکاوانە باسی حاڵەتەکەی بۆ کرد و وتی: شتێک نەماوە ئێمە بۆتی بکەین، ڕەنگە تەمەنێکی کەمت مابێ، زۆر لام سەیر بوو ئەو ڕاشکاویە لەگەڵی، نەخۆشەکە خودی خۆی زۆر بە واقیعیانە وەری گرت، بێ ئەوەی هیچ کاردانەوەیەکی نەشیاوی هەبێت.

ئەزموونی ڕاستگۆبوون لەگەڵ نەخۆش لەوێ فێر بووم، ئەوەی کە دەبێ یەکەمجار زۆر بە ڕاشکاوانە بە نەخۆشەکە بڵێت کە چییەتی و چۆنە، دواتر لەسەر ڕەزامەندی نەخۆشەکە بە خانەوادەکەی بگوترێ.

لای خۆمان هەوڵەکان بۆ ئەوە دەدرا واقیعەکە لە نەخۆش بشاردرێتەوە، پێی نەگوترێ کە چییەتی. ئەوکات نەمدەزانی سەرسامی ڕاشکاوی دکتۆرەکە بم یان واقیعیبوونی نەخۆشەکە،

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یاخود دان بەخۆداگرتنی خێزان و منداڵەکانی، لە یادمە پیاوەکە ڕۆژانە کتێبی دەخوێندەوە و بە ئارامی ژیانی خۆی دەژیا، بەبێ ئەوەی ترسی لە مردن هەبێ.

لە ئەخلاقی پیشەی پزیشکیدا بڕگەیەک هەیە پێی دەگوترێ (Patient’s Confidentiality) واتا تەنها نەخۆش بۆی هەیە بڕیار بدات کێ چی لەسەر ئەو بزانێت.

ڕوونتر بڵێم، لە پەیوەندی نێوان نەخۆش و پزیشکدا ئەو شتە هەیە، یانی تا نەخۆش ویست و خواستی لەسەر نەبێ، دکتۆرەکە ناتوانی هیچ شتێک دەرببڕێ.

ناکرێ بە ئاماژەیەکی بچووکیش بێت پزیشک ئەوە دەربخات کە لە نێوان خۆی و نەخۆشەکەدا هەیە. بۆ نموونە ناکرێ و لە ئەخلاقیاتی پزیشکی دوورە پزیشکێکی نەخۆشییەکانی دڵ بڵێت: فڵانە کەس نەخۆشی منە و دێتە لای من، چونکە بەو واتایە دەری خستووە کە کەسەکە نەخۆشییەکی دڵی هەیە.

جا ئەو متمانەیە زۆر دیار و باو بوو لەناو نەخۆشەکانی ئەڵمانیا، و لە پەیوەندییان لەگەڵ پزیشکەکەیاندا.

باسکردنی باری تەندروستی نەخۆش مافی نەخۆشەکە خۆی بوو یەکەم جار، وە لەسەر ڕەزامەندی ئەو دەکرا لەگەڵ دەورووبەر و خانەوادەکەی باس بکرایە، تەنها لە حاڵەتێک نەبێ کە خودی نەخۆشەکە توانای ئەقڵی لە دەست دابێ و توانای بڕیاردانی نەبێ، ئینجا دەکرا لەگەڵ خێزان یان دەوروبەری قسە بکرایە یەکەم جار.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## ڕێزگرتن لە ویستی نەخۆش

لە نەخۆشخانەی زارلویس لە بەشی هەناو، کابینەیەکی بچووک هەبوو تایبەت بوو بە جگەرەکێشان، هەر نەخۆشێک حەزی بە جگەرەکێشان بکردایە دەچووە ناو ئەو کابینەیەوە جگەرەی دەکێشا، بێئەوەی زیانی بۆ کەس هەبێ.

بێگومان پزیشکەکان دەبێ ڕێنمایی بدەنە نەخۆشەکان دەربارەی زیانەکانی جگەرە، بەڵام ناکرێ بەزۆری و بەتووڕەییەوە لە نەخۆش بگەیەندرێ کە نابێ جگەرە بکێشێ. ئەوەی وەک پزیشک لەسەرمانە پێویستە بیکەین، بەڵام هیچ شتێک بە زۆری و بێ ڕەزامەندی نەخۆش ناکرێ، هەتا ئەگەر زیانیشی هەبوو بۆ نەخۆشەکە دەبێ یەکەم جار خۆی ڕەزامەندی لەسەر بێت.

## ژیانم لە دەرەوەی کارکردن و نەخۆشخانە

هەر لە منداڵییەوە یەکێک لەو شتانەی زۆر حەزم پێ کردووە، وەرزش و یاری تۆپێن بوو، لەکاتی کۆلێژ لەو ساڵانەش کە لە هەولێر پزیشکی نیشتەجێی خولاو بووم، لەگەڵ هاوڕێکانم زووزوو یاریمان دەکرد.

لە ئەڵمانیاش وەک پشووێکی دەروونی، ناوەناوە وەک تیمی نەخۆشخانە ڕۆژانی پێنج شەممە یاریمان دەکرد، لەوێ هۆڵی تایبەتی وەرزش هەبوو بە جلوبەرگی تایبەت و کاڵەی تایبەت

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

یاریمان دەکرد، لە یاریکردنیش بە ڕێکی و بەسیستەم بوو، زیاتر بۆ ئارامی و پشوودان بوو.

هەندێ جار دوای تەواوبوونی یارییەکە، خواردنەوەیان دەهێنا و دەیانخواردەوە، دواتر کۆتایی پێ دەهات و بۆ بەیانی بەشێوەیەکی ئاسایی دەوامبمان دەکرد. بەحوکمی ئەوەی لە تۆپی پێ زۆرباش بووم، ئینجا یەکێک لە خەونەکانی منداڵیشم ئەوەبوو ببمە یاریزانی هەڵبژاردەی وڵات، جا ڕێکەوتێکی زۆر خۆش ڕوویدا بۆم.

ئەو ساڵەی لەوێ بووم، خولی نەخۆشخانەکانی ئەڵمانیا هەبوو لە نزیک فرانکفۆرت، هەر نەخۆشخانەیەک و تیمی خۆیان هەبوو، بەپێی خشتەیەک یارییان دەکرد، نزیکەی ٣٥٠ تیم بوون نەخۆشخانەکەی ئێمەیش بەژداربوو، منیش یاریزانی تیمی نەخۆشخانە بووم. یارییەکان لە نزیک شاری فرانکفۆرت ئەنجام دەدران لەسەر شێوازی (سقوط فردی) واتا هەر تیمێک بدۆڕایە، تیمێکی تر دەهاتە شوێنی، یارییەکان هەمووی ٢٠ خولەک بوون، ساڵانە تیمی نەخۆشخانەکەی ئێمە ڕیزبەندی دەگەیشتە ١٥٠. لە دوای ئەو ساڵەی من لەگەڵ تیمەکەم بووم، ئاستێکی زۆر باشمان پێشکەشکرد، تیمەکە بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو هاتە پێشەوە.

کاتەکانی دەرەوەی نەخۆشخانە جگە لە وەرزشکردن، بە کۆبوونەوە لەگەڵ هاوڕێکانمان زیاتر ئەو کوردانەی لە هەمان شار بووین بەیەکەوە کۆدەبووینەوە، باسی نەخۆشخانە و کاری خۆمانمان دەکرد لەگەڵ یەکتری و هەموومان هەمان کێشە و گرفتمان هەبوو، لە سەرەتاکان لە زمان و لێکتێنەگەیشتن لە هەڵسوکەوتمان لەگەڵ کولتووری نوێ، باسی قۆناغی خوێندنمان لەگەڵ یەک دەکرد.

لەیادمە لە مامۆستایەکی زمانی ئەڵمانی لەکاتی کۆرسەکە ئەوەی بۆ باسکردبووین کە ئەڵمانەکان بەشێکی زۆریان بەتەنیا دەژین،

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئـەوکات نەماندەزانـی هـۆکاری چـی بـوو، بـەڵام دوای کارکردنمـان تێگەیشتین ئـەوان لەبـەر دەوام و ئەرکـی زۆر بەیانیـان زوو دەردەچـن و تـا ئێوارە درەنـگ ناگەڕێنـەوە، بۆیـە کاتیـان نییە بۆ خێزان و منداڵ و لایـان زەحمەتـە، بیرمـە یەکێـک لـە پەرستارەکان کـە نـاوی «ئیلیزابێت» بـوو جارێـک لێـم پرسـی: چـۆن یـەک منداڵـت هەیـە و ناتـەوێ منداڵـی زیاتـرت هەبـێ؟ گوتـی: دکتـۆر شـوان ئەگـەر منداڵێکـی تـرم هەبـێ، دەبـێ واز لـە کارەکـەم بهێنـم، ڕەنگـە بـەم شـێوەیە کارەکـەم لەدەسـت بـدەم، مێردەکەشـم هـەر کار دەکات، کەسـمان لـە مـاڵ نیـن بۆئـەوەی منداڵـی تـر بەخێـو بکەیـن، پارەکەیـش بەباشـی بەشـمان نـاکات.

بەشـێوەیەکی گشـتی حکومەتـی ئەڵمانیـا زیاتـر گرینگـی بـە کار دەدات بـەراورد بـە حکومەتـی فەڕەنسـی،

فەڕەنسـا یەکێـک بـوو لـەو وڵاتانـەی کـە زۆر گرینگـی بـە کەشـی خێـزان دەدا.

لەمیانـەی کارکردنـم لەگـەڵ چەنـد سـەرۆک بەشـێک لـە نەخۆشـخانەکەدا، تێبینـی هەندێـک هەڵسـوکەوتیانم کـرد، بۆنمونـە دکتۆرێـک کـە بەرپرسـی بەشـی هەنـاو بـوو، دکتۆرێکـی تـر کـە بەرپرسـی بەشـی نۆبـەی مێشـک بـوو. ئـەوان کێشـەیەکی کەسـی و تایبەتـی لـە نێوانیاندا ڕوویدا، منیش لەگەڵ هەردووکیـان کارم دەکرد، دەبـوو زۆر بەڕێکـی هاوسـەنگیم لـە پەیوەندیـم لەگەڵیـان ڕابگرتایـە، هەرچەنـدە نەخۆشـخانە ببـووە دوو بـەش، بـەڵام بـۆ مـن گرینـگ بـوو کارەکانـی خـۆم بکـەم، بێئـەوەی لایەنگـری هیـچ کامێکیـان بکـەم.

مـن میـوان بـووم لـەوێ، نەدەبـوو خـۆم بـەراورد بکـەم لەگـەڵ ئەوان، هەمـوو هەوڵـم بۆ ئـەوە بـوو زیاتـر کار بکـەم، بەقـەد دوو سێ دکتـۆری ئەڵمانـی کاربکـەم، بـۆ ئـەوەی بتوانـم ئـەو شـتانە بەدەسـت بهێنـم کـە بۆیـان هاتبـووم.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

گرینگە مرۆڤ شوێنی خۆی بزانێ و بتوانێ هاوسەنگییەک دروست بکات، بۆ ئەوەی ئامانجەکانی لەدەست نەدات.

جارێکیان وەزیری تەندروستی ئەو کاتی حوکمەتی هەرێمی کوردستان، سەردانی ئەڵمانیای کرد و ئەو ناوچەیەی کە ئێمەی لێ بووین بەسەری کردەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو کە ئێمەی پزیشکانی کوردی بینی لە نەخۆشخانەکانی ئەڵمانیا کار دەکەین و پەرە بە لایەنی پیشەییمان دەدین. ئێمەیش سەردانیکردنەکەیمان بەرز نرخاند.

دوای هەفتەیەک لە گەڕانەوەی بۆ هەولێر، هەواڵی ئەوەیان پێ ڕاگەیاندین ئەو بڕە پارەیەی وەرمان دەگرت لەگەڵ مۆڵەتی خوێندن (بدل عدوی) لێمان بڕابوو.

کاتێ وەزیری تەندروستی هاتە لامان و پێی گوتین کە شانازیمان پێوە دەکەن بەوەی ئەو کۆمەڵە پزیشکە لەو وڵاتە خزمەت دەکەین، بەڵام بۆچی دواتر ئەو بڕە پارەیەی لێ بڕین؟ ئێمە پزیشکی میوان بووین و مووچەیەکی جێگیرمان نەبوو لەوێ.

دوای ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی زۆر ڕایان لەو کۆمەڵە پزیشکە بوو کە لەوێ دەستبەکاربوون، دکتۆر نیهاد و دکتۆر هاید السۆفی بڕیاریان دا ٥٠ دکتۆر لە کوردستانەوە بهێنە ئەڵمانیا، چەند جار بۆ ئەم مەبەستە سەردانی کوردستانیان کردبوو ٥٠ دکتۆر هەڵبژێردرابوون، بەڵام دواتر ئەم پرۆژەیە سەری نەگرت ٥٠ دکتۆرەکە نەهێندرانە ئەڵمانیا. پێم وایە بابەتەکە لە لایەن وەزارەتی خوێندنی باڵاوە ڕەتکرایەوە، لەبەر هەندێ هۆکار کە خۆیشمان نازانین چی بوون، بەهەرحاڵ زۆر دەستکەوتێکی باش دەبوو ئەگەر ئەو دکتۆرانە هاتبان.


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## کاریگەرییەکانی دابەشبوونی ئەڵمانیا لەسەر تاکەکان

نزیکەی چارەکە سەدەیەک بەسەر یەکگرتنەوەی ئەڵمانیای خۆرهەڵات و ئەڵمانیای خۆرئاوا تێپەڕیوە، بەڵام کاریگەرییەکانی لەسەر خودی تاکەکان هەر بەجێماوە.

پێم خۆشە باسی دوو یادەوەری بکەم کە لە کاتی کارکردنم تووشیان هاتم و دواتر دەکرێ بە خاڵی گرنگەوە پەیوەستیان بکەینەوە.

جارێکیان نەخۆشێکمان بۆ هات لە بەشی فریاکەوتن، من نەخۆشەکەم وەرگرت و دواتر لەگەڵ لێپرسراوی بەشەکەم بەیەکەوە ڕۆیشتینەوە لای و بینیمانەوە، نەخۆشەکە ڕۆژنامەنووس بوو، لە ڕۆژنامەیەک کاری دەکرد کە سەر بەو شارانە بوو کە پێشووتر کەوتبووە ژێر حوکمڕانی ئەڵمانیای خۆرهەڵات.

گفوگۆیەکی خۆش ڕووی دا و وەک خۆی باسی دەکەمەوە، لێپرسراوی بەشەکە بە ڕۆژنامەنووسەکەی گوت: من تا ئێستاش کێشەم لەگەڵ ئەو ڕۆژنامەیەی ئێوە هەیە و هەست دەکەم چەند شتێکی دیاریکراوم پێ دەبەخشێ و قاڵبی بابەتەکە لە شێوەیەکی نەگۆڕ دەگاتە بەر دیدی خوێنەر، بە شێوەیەک باسی بابەتێک دەکەن، وەک بڵێی تەنها ئەم ڕووەی ڕاستە و هەر ئەوەیش دەکەنە پەیامی بابەتەکە بۆ خوێنەر، خوێنەر جێناهێڵن خۆی بڕیار بدات لەسەر ڕاستی و درووستی شتەکان، لەکاتێکدا لە ڕۆژنامەکانی ئەو شارانەی کە پێشووتر سەر بە حوکمڕانی ئەڵمانیای خۆرئاوا بوون،



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەو شتە بەدی ناکرێ، واتا ئەوان زۆر دیوی بابەتەکە باس دەکەن و بۆ خوێنەری جێ دەهێڵن کامە ڕاستە و کامە هەڵەیە، نەک ئەوەی خودی بابەتەکە تەسک بکرێتەوە بۆ یەک دیو.

لەو قسانەیان ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ساڵانێکی زۆرە ئەو دوو بەشەی ئەڵمانیا یەکی گرتووەتەوە، بەڵام کاریگەرییەکانی لەسەر تاکەکان ماوە، تاکی خۆرهەڵاتی بە گشتی، بەتاکی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیشەوە، دیارە کە یەک حوکمڕانی و یەک دیکتاتۆر حوکمی کردوون، یەک ئایدۆلۆژیا و یەک ڕێباز بوونی هەبووە، کە هی ئەو کاتی ئەڵمانیا شیووعییەت بووە، هەر لەبەر ئەوەیشە تاکەکان هەر یەک دیوی شتەکانیان پێ نیشان دراوە و پێیان ڕاست بووە و زەحمەتە بتوانن گۆڕانکاری لە تێڕوانین و بیر و بۆچونیان بکەن و هەوڵ بدەن زۆر لایەنی شتەکان ببینن و دواتر بە شێوەیەکی گشتی بڕیار بدەن، نەوەک تاک لایەن و یەک گۆشە.

هەر لەسەر هەمان بابەت، هەندێجار کاتێ لەگەڵ پەرستارەکان لە کاتی ئێشکگری شەوانە کاتمان دەبوو، گفتوگۆمان دەکرد لە ڕەدهە، یەکێ لە پەرستارەکان جارێک گوتی: دکتۆر شوان ئەو خەڵکانەی دانیشتووی شارەکانی سەر بە ئەڵمانیای خۆرهەڵات بوون، کاتی خۆی لە نەخۆشخانەکان کەلوپەلی گشتییان دەبرد و بۆ مەبەستی کەسی بەکاریان دەهێنا، دیارە کە باری ئابوورییان باش نەبووە و پەنایان بردووەتە بەر موڵکی گشتی و ئەو دیاردەیە سەری هەڵداوە لە ناویان.

ئەوە دەرخەری ئەوەیە کە کاتێ باری ئابووری و گوزەرانی خەڵک باش دەکەی، دیاردە ناشیرنەکان بوونیان نامێنی و بە ئەمەکەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەلوپەلی گشتی دەکرێ، بەڵام

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نەبوونی و هەژاری وا دەکەن مرۆڤەکە نەتوانێ شارستانیانە هەڵسوکەوت لەگەڵ موڵکی گشتی بکات. ئەو نموونانەی ئەو پەرستارە باسی دەکرد بەدڵنیاییەوە لەسەر ئاستی تاک و کەسی بووە و گشتگیر نەبووە.

کاریگەری ئەو سیستەم و حوکمڕانییەی تاکەکان لەسەری دەڕۆن، درێژخایەنە و لە نائاگادا دەمێنێتەوە و درێژەی هەیە.

وەک گوتم کە ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی لە ژێر سیستەمێکی دیکتاتۆری، و ئەڵمانیای خۆرئاوایی لە ناو سیستەمێکی دیموکراتدا دەژیان.

جا کاریگەری ئەو سیستەمانە لەسەر کەسایەتی تاکەکان ڕەنگی دابوویەوە، بۆنموونە، وەک بەشێکی خەڵکی خۆرهەڵاتی، دانیشتووانی ناوچەکانی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی ئێستایش، مرۆڤی هەستیارن، زوو هەڵدەچن و تووڕەدەبن، تێبینی و ڕەخنەکان بە کەسی وەردەگرن و زیاتر لە ژێر پەستانی کەسیدان.

لە زارلاند (کە یەکێکە لەو ناوچانەی کەوتبووە ئەڵمانیای خۆرئاوا) لە نەخۆشخانەکەمان پسپۆرێکی لێ بوو، زۆر زوو تووڕە دەبوو، ئارامی کەم بوو، کاتێ باسی هەڵەیەکیان دەکرد، ئەو زوو بە خۆی تێدەگەیشت و زۆر هەستیار بوو، جا لە یادمە کارمەندەکان دەیانگوت ئەوە دکتۆرێکی زۆر (Ossi)یە، واتا شەرقییە، ئەم وشەیە وەک عەیبەیەک بەکاردەهێنرا، لە بەرامبەر ئەو کەسانە.

زۆر دیار و ڕوون بوو کاتێ کە لە ژێر حوکمڕانییەکی چەوسێنەر و دیکتاتۆر دەژی، کەسایەتی مرۆڤەکەش ڕەنگدانەوەی ئەو سیاسەتە دەبێ کە پەیڕەو دەکرێ، بە مانایەکی تر ناهێڵن مرۆڤەکە لە قاڵبێکی ئازاد ژیان بکات، کەسایەتی ترسنۆک و پڕ لە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نائارامی دروست دەکەن.

جا کاتێ بڕیارم دا بڕۆمە ڕۆستۆک، هاوڕێکانی زارلاندم زۆریان پێ ناخۆش بوو، دەیانگوت خەڵکی ئەوێ (بەشێکە لە ئەڵمانیای خۆرهەڵات) سرووشتیان جیایە و لێرە بمێنەرەوە بۆ تۆ باشترە، ئەوەی دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە کە چۆن خەڵکی هەمان وڵات، هەمان نیشتمان، هەمان پێکهاتەی جین، چۆن دابەشبوون بەسەر دوو لایەن، خۆیشیان بە ئاشکرا هەر هەستی پێ دەکەن، دوای زیاتر لە چارەکە سەدەیەکش.

ڕۆستۆک بۆ من پڕی بوو لە مرۆڤ و هاوڕێی باش، خەڵکی دڵئاوا. حەتمەن تاک تاک لە ڕۆستۆک و لە زارلاندیش مرۆڤ و حاڵەتی نائاسایی دێنە پێش، بەڵام ناکرێ گشتگیر بم.

جا یەکێ لەو شتانەی پێکەنیم لەگەڵی ئەوە بوو، خەڵکی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی-زارلاند بە دانیشتووانی خەڵکی ئەڵمانیای خۆرئاوایی-ڕۆستۆکیان دەگوت، (سەرە ماسی)، لەبەر ئەوەی لە دەریاوە نزیک بوون و پێیان وابوو کەسایەتی عیناد و پێداگرن، دەیانگوت وەک ماسی وان، کەللە ڕەق، جاری وا هەیە بە پێچەوانەی ئاراستەی باش هەڵدەکەن.

هەڵکەوتنی مرۆڤ لەناو سیستەم و حوکمڕانییەتێکی باش، تا سەر ئیسقان کاریگەری لەسەر کەسایەتی و جۆری بیرکردنەوەی هەیە.

ئەمە بە ڕوونی دیارە لە هەردوو بەشەکەی ئەڵمانیا و لە ناو خەڵکی خۆیشمان، کە چۆن کاریگەرییەکانی سیستەمی بەڕێوەچوونی وڵاتمان کەم تا زۆر لەسەرمان دەرکەوتووە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## یەکەم گەڕانەوەم بۆ کوردستان

دوای ماوەی زیاتر لە ساڵێک لەگەڵ هاوڕێکانمان بڕیارمان دا بگەڕەینەوە کوردستان، بۆ بینینی خێزان و دایک و باوکمان. لە ئەڵمانیا بۆ تورکیا، لەوێوە بۆ هەولێر، ئەوکات فرۆکە نەبوو لە هەولێر، بۆیە تووشی ماندوبوونێکی زۆر دەبووین کاتێ دەگەڕاینەوە، ئەو هەمووە کاتژمێرە لەڕێگا دەماینەوە.

هەستێکی زۆر خۆش بوو کاتێک گەڕامەوە، بەتایبەتی بە بینینی خوشکەکەم (شەوین) کە ئەو کات بۆ دوا جار بوو بینیم، نەخۆشی تالاسیمیای هەبوو، دوای گەڕانەوەم بۆ ئەڵمانیا کۆچی دوایی کردبوو، بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژماینەوە، لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و برا بەیەک شاد بووینەوە، هەستی غەریبیمان بۆ یەک دامرکایەوە، دووبارە گەڕاینەوە بۆ ئەڵمانیا.

کە گەڕاینەوە بۆ ئەڵمانیا حەزم کرد دەست بە خوێندنم بکەم بۆ پسپۆری ورد، لە بەشی نەخۆشییەکانی دڵ، هەر لە سەرەتای دامەزراندنمەوە خولیای ئەو بەشەم هەبوو

سەرۆک بەشەکەم زۆر پێی خۆش بوو پسپۆری بخوێنم بۆ بەشی نەخۆشییەکانی گەدە و قۆڵۆن و نازور، زۆر دەیگوت ئەگەر لەگەڵ من بمێنیتەوە، زۆر هاوکاریت دەکەم و فێرت دەکەم و لەگەڵت دەبم، بۆ ماوەیەک کارم لەگەڵ کرد، بەڵام زانیم ئەو بەشە نییە کە من دەمەوێ و ناتوانم لێی سەرکەوتوو بم، دواتر لە ئینتەرنێت زۆر گەڕام بۆ ئەوەی ئەو زانکۆیانە بدۆزمەوە کە دەتوانم نەخۆشییەکانی دڵیان لێ بخوێنم، بە هاوکاری هاوڕێکەم بە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ناوی زاشا (Sascha) ئیمەیڵمان بۆ ٨ پرۆفیسۆر و سەرۆک بەش نارد، لای خۆم گوتم هەرکامیان یەکەمجار وەڵامم بدەنەوە، دەچمە لای ئەو لە هەر شارێک بێت.

ئیدی دکتۆرێک وەڵامی دامەوە و قبووڵی کردم، کە لە شاری ڕۆستۆک بوو، بڕیارم دا بچمە لای و لە نزیکەوە قسەی لەگەڵ بکەم. ڕۆستۆک لەسەر دەریای باکوور بوو، دەکەوێتە نێوان شاری بەرلین و هامبۆرگ. مەودای نێوان ڕۆستۆک و زارلاند بە هێندەی مەودای نێوان هەولێر و بەسرا بوو، بە شەمەندەفەر سەفەرم کرد بۆ ڕۆستۆک.

## گەشتک بەرەو ڕۆستۆک

بە شەمەندەفەر بەرێکەوتم بۆ شاری ڕۆستۆک. ڕۆستۆک یەکێ لە شارەکانی سەر بە ویلایەتی (Mecklenburg Vorpommern) بوو، کە دەکەوێتە باکووری ئەورووپا و سەر دەریای بەڵتیق.

زانکۆکەیشی لە ساڵی ١٤١٩ دامەزرا بوو، بە یەکێک لە کۆنترین زانکۆکان هەژمار دەکرێ و لە لە سەرانسەری جیهان پێگەیەکی ئەکادیمی باش و دیاری هەیە.

بە سێیەم کۆنترین زانکۆی ئەڵمانیا و بە یەکێ لە باوەڕپێکراوترین و کۆنترین زانکۆکانی باکووری ئەورووپا دەژمێردرێ.

لە ڕێگا زۆر ماندووبووم، شەوێک لەوێ مامەوە، دواتر پەیوەندیم بە سەرۆک بەشەکەوە کرد و گوتم کە دەمەوێ ببینم، کاتێک لەگەڵی دانیشتم، یەکەم قسەی ئەوە بوو کە گوتی: هاوڕێیەتی لەگەڵ ئێوە نەمرە و بەردەوامە.


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خۆی کەسێک بوو حەزی بە خەڵکی خۆرهەلات دەکرد و خۆشی لێیان دەهات، هۆکاری وەلام داناوەی ئیمەیلەکە هەر ئەوە بوو کە زانیویەتی خەڵکی کوردستانی عێراقم.

بۆی باس کردم کە هاوڕێیەکی نزیکی لە هامبۆرگ، بە ڕەگەز خەڵکی سووریا بووە، ئێستا دکتۆرێکی زۆر بەناوبانگە لە سووریا، پسپۆڕی نەخۆشیەیکانی دڵە، زۆر چێژی لە هاوڕێیەتی ئەو بینیوە، بەیەکەوە دەوامیان کردووە.

زۆر بە ڕاشکاوانە گوتی: دێیتە لام دەست پێ بکەیت؟ گەر بێیت یارمەتیت دەدەین و هاوکاریت دەبێ بۆ هەر شتێک پێوستت بێت، زۆر خۆشحاڵ بووم بەم پێشنیارە، گەڕامەوە زارلاند و بۆ ماوەی ٨ کاتژمێر لە ڕێگا بووم، بڕیاری خۆم دابوو و خۆم یەکلایی کردبۆوە کە دەمەوێ لەگەڵ ئەو پڕۆفیسۆرە دەست بە خوێندنی پسپۆڕی بکەم. کارە ئیدارییەکان زۆری دەویست نزیکەی ٦ مانگ خەریکیان بووم.

شەش مانگ کاروبارەکانی گواستنەوە ڕاگیران، بە هۆی ئەوەی ئەڵمانیا ١٦ ویلایەتە و هەر ویلایەتێک سەربەخۆیە و هیچ لایەنێکی ئیداری کەس مەجبوور ناکات بە پێی یاسا و دەستووری ولایەتێکی تر کار بکات، یاسا سەروەر بوو و هەر ئەو کاری پێ دەکرا.

هۆکارەکەیشی پێموایە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئێمە وەک پزیشکی میوان ڕێپیدانی بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی ئەو ولاتەمان هەبوو، نەک ڕێپێدانی سەرتاسەری و یەکسانی شهادەی ئەڵمانیا. دواتر زۆر هێنان و بردنیان پێ کردم، بەتایبەت ئافرەتێک کە هیچ ئاسانکارییەکی بۆ نەکردم.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## دەستپێکی قۆناغێکی نوێ لە ڕۆستۆک

دوای سێ ساڵ ژیانم لە شاری زارلاند، بڕیاری جێهێشتنم دا، کاتێ هەموو کاروبارەکانم تەواوکرد،ماڵئاواییم لە هاوڕێکانم و سەرۆک بەشەکەم و هاو پیشەکانم کرد و ڕۆیشتمە شاری ڕۆستۆک، پێنج ساڵی کۆتایی ئەڵمانیام لەوێ بەسەر برد.

لە ڕۆستۆک سەرەتا نەمتوانی شوقەیەک، یان خانوویەک بەتەنها بگرم، جا شتێک لەوێ هەبوو زۆر پێم باش بوو، پێیان دەگوت (لەگەڵمان بژی - Wohn gemain schaft) ئەوە بوو کە دەکرا لەگەڵ یەک دوو کەسی تر شوقەیەک بەیەکەوە بگرن و تێیدا بژین.

لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە دەگەڕای و شوقەیەکی خۆشت دەدۆزیەوە و کرێیەکەشی دابەش دەکرا. من و دوو کەسی تر کە قوتابی بوون، شوقەیەکمان گرت و ژوورەکانمان سەربەخۆبوون و بەیەکەوە دەژیاین.

کاری پاککردنەوە و ڕێکخستن و چێشتخانە و دەستشۆریشمان وەک خشتەیەک لێکردبوو، لە نێوان خۆمان دەسووڕایەوە و پابەند بووین پێیەوە. ئەوە بووە هۆکاری ئەوەی کە من زیاتر لەگەڵ چینی قوتابیان و گەنجان یەکتر بناسین، کۆتایی هەفتەمان بەیەکەوە بەسەر دەبرد.

نەخۆشخانەکەی لێی دەستبەکاربووم، سەر بە زانکۆی ڕۆستۆک بوو، نەخۆشخانەکە فێرکاری بوو، سەرۆک بەشەکەم پرۆفیسۆر بوو لەو زانکۆیە، بەهۆی ئەوەی ڕۆستۆک زۆر گەورە بوو، نەخۆشخانەکانیشی زۆر قەرەباڵغ بوون زۆربەی نەخۆشییە سەختەکان لەوێ چارەسەر دەکران.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لە ماوەی سێ ساڵ کارکردنم لە زارلاند، شارەزایم لە سیستەمی تەندروستی ئەڵمانیا پەیدا کردبوو، زمانیشم زۆر باشتر ببوو، بێ کێشە ژیانی ڕۆژانەم لەگەڵ نەخۆشەکان بەسەر دەبرد.

بەڵام بەدڵنیاییەوە شاری نوێ، نەخۆشخانەی نوێ، ستافی نوێ، بەشی نوێ و سیستەمی نوێ، ئەوەش کەمێک کاتی دەویست تا لەگەڵی ڕاهاتم و فێری بووم.

شایەنی باسە ڕۆستۆک شارێکی دڵگیر بوو، دەکەوتە سەر دەریا و خەڵکی بۆ مەبەستی گەشتیاری زۆر ڕوویان تێدەکرد.

وەک دەستپێکی کارکردن و شارەزابوون لە سیستەمی تایبەتی ئەم نەخۆشخانەیە، سەرەتا دەبوو لە ڕەدهەی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ کار بکەم، دوای ئەوە لە بەشەکانی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ کارم کردبا، وەک هۆبەی ئیکۆ و بەشی چاودێری چڕ و بوژانەوەی دڵ و ژووری قەستەرە و نەشتەرگەرییەکانی دڵ.

بەڕێوبەری ڕەدهەکە ئافرەتێک بوو دوو ساڵی مابوو خانەنشین ببێت، بەشێوەیەکی گشتی زۆر هەوڵی دەدا ئەوەی دەیزانێ فێری کەسانی تری بکات.

خۆی لە هەر شوێنێک کەسی زیرەکی زۆر لێبوو، یان ئەوانەی کە کارت لەگەڵیان دەکرد لە ئاستێکی بەرزدا بوون، دەبێ زۆر هەوڵ بدەی لە هەمان ئاستی ئەو بێت بۆ ئەوەی دوانەکەوی و دەبێ خۆت بگونجێنی لە گەڵیان.

ڕۆستۆک بۆ من لەو جۆرە بوو کە ئاستی بەرزی زۆری لێ بوو، بۆیە لەسەرم پێویست بوو زۆر هەوڵم بدایە بۆ ئەوەی لە ئاستێکی دیاریکراو نەیەمە خوارەوە.

بەهۆی ئەوەی کە ئێمە لەشێوەی گرێبەست وەک دکتۆری میوان لە نەخۆشخانەکانی ئەڵمانیا کارمان دەکرد، مووچەیەکی جێگیرمان

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نەبوو، ئەوان پشتگیرییان لێمان دەویست بۆ ئەوەی درێژە بە کارەکانمان بدەین.

چەند جارێک لەگەڵ سەندیکای پزیشکانی ڕۆستۆک تووشی کێشە بووینەوە، دەبوو پشتگیریمان بکەن بۆ ئەوەی درێژە بە دەوامکردن بدەین. سەندیکای پزیشکانی ئەوێ ڕازی نییە کە دکتۆر بە بڕە پارەیەکی کەم و نا شایستە کار بکات، نایەنەوی دکتۆر بکەوێتە بارێکی نالەباری ئابووری، بۆ ئەم مەبەستەش ئامادەیە نەخۆشخانەکان بداتە دادگا و دان بەو بڕوانامەیەشدا نەنێت کە نەخۆشخانەکە دەیداتە دکتۆرێک کە بە پارەیەکی کەم کاری لێ دەکات.

ئەڵمانیا بەشێوەیەکی یاسایی پاڵپشتی بۆ پزیشکەکان هەیە، چ بیانی بن چ ناوخۆیی، گرینگ بوو لایان پزیشک بە پارە و موچەیەکی باش دەوام بکات، ئێمە بڕێک پارەی دیاریکراومان هەبوو کە لە کوردستانەوە بۆمان دەهات، بەڵام ئەوان بەو پارەیە ڕازی نەبوون و داوای بڕێکی زیاتریان دەکرد، دواتر سەرۆک بەشەکەم دەستی هەبوو لە یارمەتیدانم بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە، بڕێک پارەی خستە سەر پارەکەی کوردستانم و سەندیکای پزیشکان ڕەزامەندیان پیشاندا کە بەردەوام بم لە دەوامکردن.

ژیان لە دەرەوە ئەوجۆرە کێشانەی هەر هەیە و بەبەردەوامی دێنە پێشت، وەک ئەوەی لە وڵاتی خۆت بیت، لەمیانەی کارکردنم لە نەخۆشخانەی ڕۆستۆک، چەندەها قوتابیم ناسی بەهۆی ئەوەی نەخۆشخانەیەکی فێرکاری بوو بۆیە زۆرم دەبینین و بووینە هاوڕێ، یاری تۆپانێشمان بەیەکەوە دەکرد و بەیەکەوە دەچووین بۆ قاوە خواردنەوە.

یەکێ لە قوتابییەکان بانگهێشتی ماڵی خۆی کردم و بەیەکەوە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نانمان خوارد، تێبینی ئەوەم کرد کە هەموو بەرهەمەکانی خواردنی ماڵەکەی هی یەک کۆمپانیا بوون، لام سەیر بوو و وتم: چۆنە ئەوهایە؟ گوتی: ئەوە کۆمپانیایەکی خۆماڵییە و پێم خۆشە بەرهەمی وڵات و شاری خۆم بەکاربهێنم، وەک پشتگیرییەک بۆ پەرەدان بە بەرهەمی خۆماڵی.

وا ڕێککەوت، دوای ماوەیەک گەڕامەوە هەولێر و لەگەڵ باوکی خوالێخۆشبووم سەردانی ماڵی یەکێ لە هاوڕێکانیمان کرد و لەوێ خاوەن ماڵەکە ئاماژەی بەوە کرد کە یەکێ لەو بەرهەمە خواردنانەی لە ماڵەوە نەماوە لەبەر ئەوەی تەنها دروستکراوی وڵاتی عیراق مابووە و نەیویستووە خۆماڵییەکە بەکار بهێنی. زۆر گرنگە مرۆڤ بتوانێ پشتگیری بەرهەمی خۆماڵی بکات و ئەو متمانەیەی بە کاربەدەستانی وڵاتی خۆی هەبێ.

ئیتر ڕۆستۆک بەشێکی زۆر خەڵکی بیانی لێ بوو، بە باش و خراپ وەک هەموو شوێنێکی دیکە. دراوسێیەکم هەبوو ڕقی لە خەڵکی بیانی بوو هەر لە سەیرکردنەکانی دەمزانی خۆشی لێم نایەت، جا منیش ئۆتۆمبێلێکی باشم هەبوو زۆر پێی ناخۆش بوو، بەیانیان بەلامدا دەهات سڵاوی نەدەکرد، بەیانییەک لەخەو هەستام بینیم بەشی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەم هەمووی پیسبووە، تیزابی بەسەردا ڕژێندراوە و سووتاوە، تێگەیشتم کاری ئەوە، بەلام هیچ بەڵگەیەکم نەبوو، لەبەرئەوەی کامێرای چاودێریی لێ نەبوو.

بەهەرحاڵ ئۆتۆمبێلەکەم چاککردەوە، بڕێک پارەی تێچوو کە ئەو بڕە پارەیە ئەو کات بۆ من زۆر بوو، ئەوەش یەکێک لەو خووە خراپانەی کە هەندێ مرۆڤی ڕەگەزپەرست و خۆپەرست پێیان ناخۆش بوو خەڵکی دیکە کار و ژیان و ئۆتۆمبێلی باشیان هەبێ، وەک بڵێی بەشی ئەوان بێت و لێت بردبن.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هاوڕێ و کەسی زۆر باشیشم هەبوو لەوێ، زۆر ڕێزیان دەگرتی و هاوکارت بوون و پێیان خۆشبوو بتناسن، بەهەرحاڵ ئەو جۆرە مرۆڤانە لە هەموو کۆمەڵگەیەک هەن بە باش و بە خراپ.

## ڕێزگرتن لە یاسا

یاسا لە وڵاتی ئەڵمانیا سەروەرە و بۆ هەمووان وەک یەکە و هەموو وەکو یەک پێوەی پابەندن.

یەکێ لەو شتانەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام، پێم خۆشە باسی بکەم.

شەوێکیان دوای ماندووبوونێکی زۆر لە درەنگانی شەو لە کار دەگەڕامەوە، شەقامەکان چۆڵبوون و گڵۆپەکانی ترافیک سوور بوون، ئۆتۆمبێلی پۆلیسم بینی، لە ترافیک وەستابوو، لەگەڵ ئەوەی کە شەقامەکان هیچ ئۆتۆمبێلێکی تری لێ نەبوو، بەڵام وەستا و لە سوور نەڕۆیشت تا گڵۆپی سەوز داگیرسا و دواتر ڕۆیشت. بە بەراورد لەگەڵ بەرپرسانی خۆمان و ڕێزلێنەگرتنی بەشێکیان. بەڵام لە ئێستادا ئەو حاڵەتانە زۆر کەمترن لە جاران.

نموونەیەکی تر، جارێکیان لە فەڕەنسا دەگەڕاینەوە شەو درەنگ بوو لەگەڵ هاوڕێکانم لە وێستگەی شەمەندەفەر دابەزین، دوو کارمەندی لێبوون، داوای ناسنامەیان لێ کردین، یەکەمجار بوو کە داوای ناسنامەمان لێ بکرێ، بە شێوەیەکی زۆر جوان داوایان کرد. لێرە لە وڵاتی خۆمان زۆر ئەو دیاردەیە هەیە، دەڕۆیتە هەر شوێنێک داوی ناسنامەت لێ دەکرێ.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خۆی وڵاتی باش پێکهاتووە لە هەموو سێکتەرێکی باش، بەو واتایەی سیستەمی تەندروستی باش، سیستەمی پەروەردە و فێرکردنی باش، پۆلیس و ئاسایشی باش، خەڵک و تاکی باش، یاریزانی باش، دووکانداری باش، چێشتخانەی باش، بۆنفرۆش و گوڵفرۆشی باش.

ئیدی بەم شێوەیە وێنەیەکی باش و جوانی وڵات نیشان دەدەن و هێز و باشی و ئارامی و پێشکەوتن دروست دەکەن.

## کۆمەڵە کەسایەتییەک لە ڕۆستۆک

### سەرۆک بەشەکەم

یەکێک بوو لەو کەسانەی زۆر هاوکار و پاڵپشتم بوو لە ڕۆستۆک و لە گەشتی خوێندنی زانستی نەخۆشییەکانی دڵ لە بواری زانستی زۆر پێشکەوتوو بوو، سەرۆکی بەشی نەخۆشییەکانی دڵ بوو لە ڕۆستۆک، تایبەتمەندییەکی هەبوو زۆر گرینگی بە توێژینەوەی زانستی دەدا، ئەو کاتەی من لە وێ بووم خاوەنی ۲۰۷ توێژینەوەی زانستی بوو، یانی ساڵانی ۲۰۰۷، ئێستا زۆر زۆر زیاترە هەمیشە لە کۆنگرە و کۆنگریسی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ بو،و دەڕۆیشتە چین، یابان، ئەمریکا و ئەورووپا، زۆر چالاکبوو لەسەر ئاستی هەموو جیهان بە تایبەت بانگیان دەکرد بۆ کۆنگریسەکانی تایبەت بە نەخۆشییەکانی دڵ.

کەسایەتییەکی زۆر نەرمی هەبوو، خەڵکی بە یەکجار چارەسەر دەکرد، حەزی دەکرد هەموو پێبگەن و فێربن و یارمەتیان بدا، چونکە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

خۆی لە قۆناغێکی زۆر بەرز بوو، باکی نەبوو بە باشتربوونی هیچ کەس لە خۆی، چونکە چونکە خۆی تێگەیشتبوو کە زۆری کردووە و پیر بووە.

## سەرۆکی بەشی قەستەرە

کەسێکی زیرەک بوو یەکێک لەو دکتۆرانە بوو کە کارم لەگەڵی کرد لەوێ، لە ڕەدهە نەخۆشی هەبوون لە کاتی چارەسەرکردنی نەخۆشەکان زۆر زیرەکانە مامەڵەی دەکرد، یەکێک لەو کەسانانەی کە زۆر پێی سەرسام بوو مامۆستایەکی بوو کە پێشووتر لە هەمان نەخۆشخانە کاری دەکرد، دواتر لەبەر چەند هۆیەک ئەو نەخۆشخانەی جێهێشت. شایەنی باسە ئەم دکتۆرە لە پرۆسەی قەستەرە «تاڵدانان» زیرەک بوو، دواتر خۆی یەکلایی کردەوە بۆ نەخۆشیی کارەبایی دڵ و پرۆسەی کەویکردن.

پێم خۆشە باسی ئەوەش بکەم کە ئەم دکتۆرە لەگەڵم هاتۆوەتەوە کوردستان و ئێستاش لەگەڵ سەرۆک بەشەکەم ناوە ناوە دێن بۆ چارەسەرکردنی کۆمەڵێک نەخۆش کە پێویستیان بە پرۆسەی کەویکردن هەیە.

جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێک پزیشکی گەنج و دکتۆرێک سەردانی نەخۆشەکانمان دەکرد، ئەوکات من سەرۆکی ڕەدهەکە بووم، پزیشکەکان لە دکتۆرەکەیان پرسی: چۆن دەبێت دکتۆرێکی بیانی سەرۆکی ڕەدهەی نەخشخانەی ئەڵمانی بێ؟ ئەویش لە وەڵام دا وتی: هەموو کەس ئەگەر زیرەک بوو هەوڵی دا مافی ئەوەی هەیە لە شوێنی باش بێ و بەرپرسیارێتی بدرێتێ، ئێوەیش ئازابن و بە ڕەگەز و نەتەوە نییە، بەڵکو بە عەقڵە.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## یەکێ لە پزیشکە پسپۆرەکان

دکتۆرێکی زیرەک بوو لە بواری توێژینەوەی زانستی و قەستەرە «تاڵدانان» بەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ سەرۆک بەشەکەم بۆ ماوەیەکی زۆر لەو دوو بوارە کاریان کردووە، بەڵام لە مامەڵکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشی ڕەدهە وەک پێویست نەبوو کەمتر ئەو کارەی کردبوو، ئیدی هەر مرۆڤێک لە چەند تەوەرەیەکی دیاریکراودا زیرەکی هەیە.

کەسایەتی ئەو لەو جۆرانە بوو کە پێی خۆش بوو ئەوەی کاری لەگەڵ دەکات تەواو لەژێر دەستی بێت، یانی هەموو کاتێک کە ئەو وتی بیکەن، یان بۆ هەموو شتێک پرسی پێبکەیت، ئەوەش لەگەڵ کارکردنی من نەدەگونجا، پێم خۆش بوو سەربەخۆ بم و لەژێر دەستی هیچ کەسێک کار نەکەم، بۆیە هەندێ جار ناوی لە خشتە لادەبردم، چونکە بەم جۆرە نەمدەکرد کە ئەو دەیویست.

بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زیرەک بوو، شتی لێ فێر دەبووم. کەسێکی مەنتیقی بوو، نازانم کێشەی چی هەبوو لەگەڵ خێزانەکەی، بەڵام هەمیشە دەیگوت: دایکمم خۆشدەوێ، بەڵام تەنها ڕێزم بۆ باوکم هەیە. بە هەر جۆرێک بێت نەیدەهێشت وەک پێویست خێرا کارەکانم بکەن، دژایەتی کەسی دەکردم.

جارێکیان ئەو دکتۆرە داوی لێکردم ڕاپۆرتێکی قەستەرەی بۆ بنووسم، هەر جارێک دەمنووسی و بۆم دەبردەوە، بەڵام هەڵەیەکی لێ دەگرت و دەیگوت دەبێ بینووسییەوە، هەڵەکانیش شتی ئاسایی بوون، خاڵبەندی و بۆشایی زیادوکەم، لەو شێوانە بوون. ٤ جاران ئەو ڕاپۆرتەی بە من چاککردەوە، دەیویست توورەم بکات و کۆنترۆڵم لە دەست بدەم، بەڵام دانم بە خۆمدا گرت و بەو شێوەیەم کرد کە داوی کردبوو لێم.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دواتـر پێـی ناخـۆش بـوو کـە وای لەگـەڵ دەکـردم، لـە چەندیـن کۆنگـرە و کۆبوونـەوەی جیهانیـش دەیبینمـەوە، هەسـت بـەوە دەکـەم کە دەیـەوێ لـە پـای ئـەو ئەزیەتانـە، هاوڕێیەتـی و نزیکیـم بکات، بـەڵام نەدەگونجـا ئیتـر، بەهـۆی شـێوازی کەسـایەتیمانەوە. بێگومـان کات و سـاتی واش هەبـوو کـە پێویسـت بـوو ڕاوێـژ لەگـەڵ سـەرۆک بـەش یاخـود پزیشـکی پسـپۆر بکـەم.

## خوێندنی باڵا و پسپۆری

لـە سیسـتەمی ئەڵمانیـا دوو جـۆر تاقیکردنـەوە هەیـە، ئـەوەی کـە مـن پێیـدا ڕۆشـتبووم یەکێکیـان تاقیکردنـەوەی (فـاخ ارتـز) کـە سـەر بـە سـەندیکای پزیشـکانە و قوتابییەکـە هەڵدەسـەنگێنێ.

لە ڕۆژێک سێ دکتۆر پرسـیارت لێ دەکەن، پزیشـکێکی خانەنشـین چاودێـری جـۆری پرسـیارەکە دەکات، ئـەوە نییـە پرسـیارێکی زۆر ئاسـان بـۆ کەسـێک و یەکێکـی تـر گـران بـۆ کەسـێکی تـر، ئامێرێکـی لێیـە هەمـوو دەنگـەکان تۆمـار دەکات، بـۆ ئـەوەی هەمـوو شـتێک ڕوون و شـەفاف بێـت و بـێ فێـڵ بـێ دواتـر نەخۆشـەکەت بـۆ دێنـن و داوات لـێ دەکـەن سـۆنەری بـۆ بکەیـت و چەنـد پرسـیار و داواکارییـان هەیـە بۆیـان دەکـەی.

جیـا لـەو تاقیکردنـەوەی بەشـی هەنـاو، ئـەوان گرینگـی زۆر دەدەن بـە بۆچـوون و هەڵسـەنگاندنی سـەرۆک بەشـەکەت کـە بـۆ مـاوەی ٣-٥ سـاڵ کارت لەگـەڵ کـردووە، چونکـە بڕوایـان وایـە ناکـرێ لـە مـاوەی ٤٠ خولـەک بڕیـاری کۆتایـی لەسـەر ئاسـتی کەسـەک بـدەی، لـە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کاتێکدا کە ئەو کەسە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ سەرۆک بەشەکەی کاری کردووە و شارەزای بووە، بۆیە داوای هەڵسەنگاندنی سەرۆک بەشەکەش دەکەن و ئەویش بە بەشێک لە تاقیکردنەوەکە دادەنرێ، دوای کەمێک وەڵامت دەدەنەوە کە دەرچوویت یان نا. ئەگەر دەرچوویت ئەوا بە مەبەستی پیرۆزبایی کردن دیارییەکت پێشکەش دەکەن بە لۆگۆی سەندیکای پزیشکانەوە.

دوای دەرچونت لەم تاقیکردنەوەش هەر ناتوانی نازناو یان پێشگری دکتۆر بەکار بهێنی لە کاتی ناو نووسین دەبێ خاوەنی توێژینەوەبیت لە پلەی (PHD)ت هەبێ. جا لە ئەڵمانیا ساڵانە ٣٠،٠٠٠ هەزار توێژینەوە ئەنجام دەدرێ و بابەتی توێژینەوەی زانستی و بەدەستهێنانی پلەی (PHD) زۆر گرینگە.

ئیدی دکتۆرێک هەبوو ڕۆژێک پرۆفیسۆرەکەم پێی گوت کە ئەو دکتۆر شوانە دەیەوێ پلەی زانستی وەربگرێ، دکتۆرا لە نەخۆشییەکانی دڵ و پێی باشە تۆ سەرپەرشتی بکەی، بانگی ژووری خۆی کردم و وتی: گەر دەتەوێ من دوو سێ دکتۆرام هەیە لەسەر مێز، وەرە بۆ خۆتی هەڵگرە، پێویست ناکات خۆت ماندوو بکەی و ڕاستەوخۆ (PHD) وەردەگری. بێگومان بۆ من زۆر ئاسان تر بوو قبووڵی بکەم، بەڵام من دەمویست خۆم فێری پرۆسەکە ببم و بەناویدا بڕۆم و شارەزا بم لە چۆنیەتی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی.

وە بە حەقی خۆم ماندووبونی خۆم (PHD) وەربگرم نەک بێ ماندووبوون و ئەوها بەو جۆرە بۆیە قبووڵم نەکرد و گوتم دەمەوێ خۆم بەژدار بم شارەزا بم لەچۆنیەتی ئەنجامدانی کارەکە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## دەستکردن بە پرۆسەی تاڵدانان (قەستەرە)

هەموو ئەو کەسانەی لە دەرەوە ژیاون دەزانن چەند زەحمەتە و هەوڵ و ماندووبوونی دەوێ کاتێک کە دەتەوێ شوێنی خۆت بکەیەوە لە سیستەمی ئەم وڵاتەدا بەتایبەت کارتی تەندروستی وڵاتێکی وەک ئەڵمانیا کە زۆر زەحمەت بوو بۆ پزیشکە ئەڵمانییەکان، چ جای بۆ پزیشکێکی بیانی وەک ئێمە، بەڵام سوپاس بۆ خوا گەیشتینە ئەو قۆناغەی لەگەڵ سەرۆک بەشەکەم بەژدار بم لە پرۆسەی تاڵدانان «قەستەرە» و شەبەکە «تۆڕ دانان» و باڵۆن کە ئەوە بە یەکێک لە پرۆسە گرینگەکانی بەشی نەخۆشییەکانی دڵ دەژمێردرێ.

دوای ئەوانە پێم باش بوو تاقیکردنەوەی (فاخ ارتز) بکەم، ماوەیەک مۆڵەتم وەرگرت و خۆم ئامادە کرد بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە «دکتۆرا لە نەخۆشیەکانی هەناو» سوپاس بۆ خوا دەرچووم، دوای ئەوە تاقیکردنەوەیەکی تریشم هەبوو لەماوەی کەمتر لە مانگێک، ئەویشمان بە سەرکەوتوویی تەواو کرد، هەستێکی زۆر خۆش بوو کە لە ماوەی مانگێک ئەویشمان بەسەرکەوتوویی تەواو کرد.

هەستێکی زۆر خۆش بوو کە لە ماوەی مانگێکدا لە دوو تاقیکردنەوەی گرینگ دەرچووم و پلەی دکتۆرام وەرگرت، چونکە ئێمە کاتمان کەم بوو، تەنها بۆ ماوەی ٥ ساڵ مۆڵەتی بە مووچەمان هەبوو، بۆیە دەبوو لەو ماوەیەدا بەشێکی باشی کارەکانمان تەواو کردبایە، من ئەو ماوەیەم زیاتر بە فێربوونی زمان و شارەزایی و کارکردن لە نەخۆشخانەکان بەسەر برد لەگەڵ دکتۆرای یەکەم، بۆیە کاتی زیاترم پێویست بوو بۆ دکتۆرای دووەم، کە بۆ پسپۆری

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ورد بوو لەسەر نەخۆشییەکانی دڵ.

بۆیە بڕیارم دا بگەڕێمەوە هەولێر و لەگەڵ بەڕێوبەری تەندروستی قسە بکەم بۆ ئەوەی بۆ ماوەی دوو ساڵی تر مۆڵەتەکەم بۆ نوێ بکەنەوە بە بێ مووچە و هاوکارم بن لە تەواوکردنی دکتۆرای دووەم، چونکە تا ڕادەیەکی زۆر ئەو پسپۆرییە وردە زۆر کەم بوو لە هەولێر.

وام دانابوو هاوکارم دەبن لە پێناو تەواوکردنی، بەڵام زۆر بە شێوەیەکی ناڕێک گوتی نابێت و کارەکەی زۆر بەکەم سەیرکرد، گوتی ئەوەی تۆ چەند ساڵێکە بۆی دەخوێنی من لێرە بە ٦مانگ دروستی دەکەم، ئاخر دروستکردن و ئامادەکردن و ڕاهێنانپێکردنی دکتۆرێک بە پسپۆرییەکی وردی وەکو نەخۆشییەکانی دڵ و شەبەکە و باڵۆن چۆن بە شەش مانگ دەکرێ؟ تێنەگەیشتم!!

خۆی ئەو کاتە کە سەنتەری دڵ کرابوویەوە لە ساڵی ٢٠٠٧، تەنها چوار دکتۆر پسپۆرییان هەبوو، لام سەیر بوو چۆن بەڕێوبەرایەتی تەندروستی ئاگادار نییە کە سەنتەرێکی وا لە هەولێر تەنها چوار دکتۆری هەیە؟ بەهەرحاڵ بەڕێزەوە سوپاسم کرد و داوام لە کەسێک کرد کە کارەکانم بۆ ڕایبکات، چونکە نەدەکرا ئەمەکی ئەو هەمووە ساڵە ئەوها بێ ئەنجام بڕوات، کارەکانم تەواو کرد و گەڕامەوە بۆ ئەڵمانیا، چونکە دەبوو خۆم بۆ تاقیکردنەوەکە ئامادەبکەم.

پێم خۆشە باسی ئەوەش بکەم کە هەر لە هەمان سەردانم بۆ هەولێر، سەرۆک بەشەکەم هات و سەردانی هەولێری کرد، بەیەکەوە بەناو شارەکەدا گەڕاین، دواتر سیمینارێکی پێشکەش بە سەنتەری دڵ کرد و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بۆ ئەو سەفەرەمان بەیەکەوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کۆبوونەوەیەک هەبوو دەربارەی زانستی نەخۆشییەکانی دڵ لە ئەمریکا، بەرپرسی بەشەکەم پێشنیاری کرد بەشداربم و سەفەر بکەم . داواکاریم نارد بۆ ڤیزە لە شاری بەرلین بە ناسنامەی عێراقی، دوای پازدە ڕۆژ ڤیزەکەم بۆ هاتەوە کە بۆ ماوەی ساڵێک کاری پێدەکرا، خەرجییەکەیشی لەسەر کۆمپانیایەک بوو، وەک پشتگیرییەک بۆ دکتۆرەکان، لەو سەفەرە سەرۆکی بەشی قەستەرە و خێزانەکەیشیمان لەگەڵ بوو، لە بەرلینەوە بەڕێکەوتین بۆ هیوستن و پاشان بە شەمەندەفەر بۆ «new orleans». ئەم جۆرە کۆبوونەوانە بۆ لایەنی پەیوەندی و کۆمەڵایەتی، پێگەیەکی باش بوون.

خەڵکی نوێ و جۆراوجۆرمان ناسی و پەیوەندیمان لەگەڵ گرتن، دوای ئەم سەفەرە گەڕامەوە و خۆم بۆ تاقیکردنەوەی دووەم ئامادەکرد.

لەگەڵ پرۆفیسۆرەکەم قسەم کرد و گوتم: دەبێ پاڵپشتی تەواوم بکەیت و داوا لە دکتۆرەکە بکەیت کە بەجدی هەوڵ بدات لەگەڵم بێت و فێرم بکات، ئیدی ئاسانکاری کرد بۆم، بەتایبەتی پرۆسەکانی وەک دانانی ئامێری ڕێکخستنی دڵ، دوای سێ بۆ چوار مانگ ڕۆژێک بۆ تاقیکردنەوەکەم دانرا. دیاسان هەفتەیەک مۆڵەتم وەرگرت بۆ تاقیکردنەوەکە، خۆم ئامادەکرد و سوپاس بۆ خوا توانیم دەرچم و پلەی یەکەم بەدەست بهێنم.

دوای ئەوەی توانیم دکتۆرا لە پسپۆری وردی نەخۆشییەکانی دڵ و قەستەرە و دانانی شەبەکە و باڵۆن (پرۆسەی تاڵدانان و دانانی تۆڕ) بەدەست بهێنم، زیاتر توانیم کار بکەم و فێربم، بەیانیان لە ٦:٣٠ی بەیانی بۆ ١١:٠٠ی شەو لە قاوشی ژێر زەمینی نەخۆشخانەکە کارمان دەکرد، بەهۆی ئەوەی سەنتەرەکەی ئێمە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

سـەنتەرێکی دیـار و باوەڕپێکـراو بـوو، نەخۆشـی زۆری لـە وڵاتانـی سـوید و دانیمارکـەوە بۆ دەهـات، بەتایبـەت ئەوانـەی تووشـی تەقینـی لەناکاوی شـاخوێنبەر دەبوون بە هەلیکۆپتـەری پزیشـکی دەگەیندرانـە سـەنتەری ئێمـە و پرۆسـەی نەشـتەرگەرییان بـۆ ئەنجـام دەدرا.

## خەڵکی ئەڵمانیا و عەقڵیەتی هەڵسوکەوتکردنیان لەگەڵ خەڵکی بیانی

کۆمەڵگای ئەڵمانـی بەشـێوەیەکی گشـتی زیـرەک و مرۆڤدۆسـتن، ڕێـز لـە مـرۆڤ دەگـرن و کۆمەڵێک بەهـای گرینگیـان هەیـە کـە زۆر پێـی سـەرسـام بـووم و پێـم خۆشـە تیشـکیان بخەمـە سـەر:

- بابەتـی پابەندبـوون بـە کات: شـتێکی زۆر گرینـگ بـوو، بـە ڕەفتارێکی ئاسایی سـەیر نەدەکرا ئەگـەر هاتوو کەسێک کەسێک لە کاتی خۆی لـە شـوێنێک نەبووایـە، دەبـووە نیشـانەی پرسـیار لەلایان. جارێکیـان لـە یادمـە بـۆ مـاوەی ٢٠ خولـەک دواکەوتـم لـە دەوام، پەرسـتارەکان بەشـێوەیەکی ئـاوا سـەیر و ناخـۆش سـەیریان کـردم، وەک بڵێـی کارێکـی زۆر نابەجێـم کردبـێ، ئیتـر تێگەیشـتم.

- بابەتـی دووەم پـاک و خاوێنـی و ڕێکـی بـوو: زۆر دەگمـەن بوو شـوێنی پیـس ببینـی، مـاڵ، شـوێنی کار، شـەقام، شۆسـتە، ئۆتۆمبێـل... هەمـوو پـاک بـوون.

سەرسـامی چۆنێتـی ئـەو هەڵسـوکەوتەیان بـووم کـە کاتێ کەسێک لەسـەر حـەق بـوو، ئیـدی هیـچ شـتێک یـان کەسـێک، بـە ڕەگـەز و ئاییـن و ئایدۆلۆژیـای جیـا نەیدەتوانـی ببێتـە هـۆی ئـەوەی حەقەکـەی بـڕوا.

دەبـوو خـۆت مانـدوو بکـەی و هـەوڵ بـدەی بـۆ ئـەوەی بگەیتـە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

کۆمەڵە دەستکەوتێک، ئەوە نییە بە ئامادەیی بۆت بێت بێ ماندووبوون. نەک تەنها لەگەڵ کەسی بیانی، بەڵکو لەگەڵ کەسی خۆشیان وابوون، بۆیە زیرەکی و عەقڵیەت زۆر ڕۆڵی هەبوو.

ئا بەم شێوەیە نرخی زیرەکی و کۆششی خۆت دەزانی لە هەمان کاتدا لووتبەرزی ناتگرێ. گرینگە مرۆڤ هەم خاکی بێت، هەم نرخی خۆیشی بزانێت.

ئەوەی لێیانەوە فێربووم لەم چەند دێڕەدا کۆی دەکەمەوە؛

«ئەوەی نایەوێ ماندوو ببێت، لێگەڕێ با لەشوێنی خۆی بێت، ئەوەیشی ئامادەیە ماندوو ببێت، دەستی بگرە و یارمەتی بدە».

مرۆڤی تەمبەڵ و تەوەزەل ئەگەر زانستیشی پێبێت ڕەنگە هەر زیانت پێ بگەیەنێت، دوای ئەو چەند ساڵە لەوێ و تەواوکردنی دکتۆراکانم ئەوە تێگەیشتم کە هەمووان بەجۆرێک لە شەڕێکی دیبلۆماسیدان.

زۆر گرینگ بوو کاتێ دەمبینی لایەنی پشەیی و لایەنی سۆزداری/ هاوڕێیەتی تێکەڵ نەدەکران. جاری وا هەبوو دوو کەس دژایەتی یەکیان دەکرد، یان کەیفیان بەیەکتر نەدەهات، بەڵام لە هەمان کاتدا لە ئێشککگریدا بەیەکەوە دەبوون و کاتی دەوامەکەش بێ کێشەی کەسی تەواو دەبوو.

هەمووان ئازادن و ناتوانیت کەس ناچار بکەیت بێتە سەر شێواز و ڕەوشت و بیرکردنەوەی تۆ.

گرینگە بتوانی زۆر دادپەروەرانە لەگەڵ کەسێک مامەڵە بکەی، کە لە بنەڕەتدا جیاوازە لەگەڵ تۆدا، بەڵام ئەم جیاوازییە قبووڵ بکەیت و بیکەیتە خاڵی هاوبەش. لە هەمان کاتدا بتوانی هەر کەسێک حەقی خۆی پێبدەیت.

جیا لە ئەزموونە پزیشکییەکە، زۆر ئەزموونی تریشم وەرگرت

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

لە چۆنیەتی ژیان و هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنم لەگەڵ کێشە و بەربەستەکان.

بۆ زۆر بابەت بیرم زیاتر ڕۆشن بوو، هەوڵی ئەوەم دەدا ئەو بەها مرۆڤایەتییانەی لەوێ دەمبینین، لە خۆمدا بیان ژیێنمەوە.

## نەژیان لە خەیاڵ و واقیعیبوونی تاکی ئەڵمانی

بەهۆی ئەو زەحمەتی و نەهامەتییانەی خەڵکی خۆرهەلات بەگشتی و بە تایبەتتر ئەو ولاتانەی لە ژێر سیستەمێکی حوکمڕانی دیکتاتۆریدان، تێیدا ژیاون، هەمیشە تاکەکان لە ناخەوە تووشی دارمانێکی دەروونی هاتوون. ڕوونتر بڵێم ڕووداوە ڕامیارییەکان و شێوازی حەکمکردنیان کاریگەرییەکانی لەسەر ئاوەزی نائاگای هەر تاکێک دروستکردووە، ئەمە وای کردووە تاڕاددەیەک لە واقیعێک ڕابکەین کە خۆمان بە شایەنی نازانین.

بۆنموونە، ئەگەربێتو بەراوردێک بکەین لە نێوان ئەو دوو کولتوورە جیاوازەدا، دەبینین تاکی ئەڵمانی واقیعبینە و دوورە لە خایاڵ. ئێمەی خۆرهەلاتی لە هەبوونی هەر خەلەل و کێشەیەکدا، ڕادەکەین و لێی هەڵدێین، دەیکەینە پێکەنین و دەیبەینە بارێکی گاڵتەجاڕی و خەندە ئامێز.

فیۆدۆر دۆستۆفیسکی لە وتەیەکیدا دەڵێ: «گاڵتەجاڕی دواهەمین بژاردەیە بۆ نەتەوە سادە و بچووکەکان».

تاکی ئەڵمانی دوورە لەو گاڵتەجاڕییە زۆرە، دوورە لە بە خەندەئامێزکردنی کارەکانی ڕۆژانە،

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئـەو شـتانەی لای ئێمـە نوکتـە و مایـەی پێکەنینـن، لای ئـەوان گاڵتەئامێـز نیـن، ئـەوەی ئـەوان پێـی پێدەکەنـن و لایـان خەندەئامێـزە، بـۆ ئێمـە مانایەکـی ئەوتـۆی نییـە.

ئـەوان جدییـن، لـە کاریـان، لـە ژیانیـان، لـە سـادەترین هەڵسـوکەوتەکانی ڕۆژانەیـان؛ لێخوڕینـی ئۆتۆمبێـل، پەڕینـەوە لـە شـەقام، دانیشـتن و هەڵسـانیان جدییـن.

کارەکانیـان بەجوانـی و بەباشـی ڕادەپەڕێنـن، چونکـە لـە واقیعـدا دەژیـن و دەزانـن شـایەنی ئـەو ڕێکوپێکیـەن. دەزانـن شـایەنی ئـەوەن کارەکانـی خۆیـان بـە باشـترین شـێوە ئەنجـام بـدەن.

بۆیە لای ئەوان زۆر ئاساییە کە باشترین هەڵبژاردەی تۆپی پێ بـن، باشـترین سیسـتەم و نەخۆشـخانەیان هەبـێ، باشـترین پزیشـک لەوانـەوە بـێ، داهێنـان بکـەن، تەنهـا تەماشـاکەری وڵاتانـی تـر نەبـن، خـاوەن بەرهەمـی خۆیـان بـن، چونکـە لـە ناخـەوە دەزانـن شـایەن بەمـەن.

بـەڵام ئەگـەر بێیـن و سـەیرێکی خۆمـان بکەیـن، بەداخـەوە دەبینیـن کـە لـە ناخـەوە ئـەو هەسـتەمان نییـە، زۆرێـک لـە کارەکانمـان بـە گاڵتەجـاڕی و پێکەنیـن بەڕێـوە دەبەیـن، خۆمـان بـە شـایەنی ئـەوە نازانیـن کـە باشـترین بیـن، چاومـان لـە دەسـتی خەڵکانـی تـرە و پێمـان وایـە ئێمـە تەنهـا تەماشـاکەرین و دەبێ دوای ئـەوان بکەویـن و ڕێچکەی تایبـەت بـە خۆمانمـان نییـە.

بۆیـە هـەر کۆمەڵگایـەک بگاتـە ئـەو ئاسـتی بیرکردنەوەیـە، لـە نـاوەوە تووشـی پوکانـەوە و دارمـان دێـت و دەسـتپێشـخەری نـاکات لـە داهێنـان، لـە هـەر بوارێکـدا.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## گەڕانەوەم بۆ کوردستان بەیەکجاری

ماڵەوە پەیوەندییان پێوە کردم کە باوکم بارێکی نالەباری تەندروستی بۆ هاتۆتە پێش و تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووە (شێرپەنجە). بۆیە هەستم کرد لە ئێستادا گرینگترین شت کە بیکەم ئەوەیە بگەڕێمەوە کوردستان و خزمەتی باوکم بکەم و خۆم لە نزیکەوە ئاگاداری باری تەندروستی بم و چاودێری بکەم. ئەگەرچی حەزم دەکرد زیاتر بمێنمەوە و درێژە بە کارکردنم بدەم و هەندێ پلانم هەبوو بۆ خوێندنی تر، بەڵام وادیارە قەدەر ئەوەندەی بۆ دانابووم.

تەنها سێ مانگم مابوو، ستافی نەخۆشخانە و هاوپیشەکانم زۆر هاوکارییان کردم، و لەم قۆناغە هەستیارەدا لەگەڵم بوون.

دوابەدوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان، ئیدی دوو کار هەبوون دەبوو گرینگی تەواویان پێ بدەم، یەکەمیان تەندروستی باوکم، دووەمیان دەستبەکاربوونم بوو وەک پسپۆری نەخۆشییەکانی دڵ لە کوردستان.

بێگومان هەر دایک و باوکێک کاتێ کە یەکێک لە منداڵەکانیان

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

دکتۆرە، پێیان خۆشە لە کاتی نەخۆشییدا لە ژێر چاودێری ئەودا بن. دایک و باوک زۆر شت دەکەنە قوربانی، ماددی و مەعنەوی، بۆ ئەوەی منداڵەکانیان پێبگەن، ئیدی چەرخی گەردوون دەسوڕێ و ڕۆژێک دێت کە دەبێ خزمەت بکرێن و پێویستییان بە هەبوونی منداڵەکانیانە لە دەورووبەریان.

سەبارەت بە دەستبەکاربوونم لە هەولێر، دەستم بە مامەڵە فەرمییەکان کرد لە بەڕێوبەرایەتی تەندروستی هەولێر و ڕاستەوخۆ لە سەنتەری دڵ دایانمەزراندم، بە هۆی ئەوەی کە پسپۆریم هەبوو لە نەخۆشییەکانی دڵ و سەنتەرەکەش پێویستی بەم پسپۆرییە هەبوو.

دوابەدوای دەستبەکاربوونم، تووشی شۆک بووم، جیاوازی سیستەم و شێوازی نەخۆشخانە بوو. بێگوومان دوای ئەوەندە ساڵە کارکردن لەسەر شێواز و سیستەمی ئەڵمانی، کەمێک زەحمەتە تا ئەو سیستەم و شێوازە نوێیە قبووڵ دەکەی. جیاوازییەکان زۆر ڕوون بوون و لە سەرەتاکانی ئەم پەرتووکە ئاماژەم پێیان داوە.

## سەرەتاکانی کارکردن

دوای دەستبەکاربوونم، سەرەتا تاکو دوو مانگیش نۆرینگەی تایبەتم دانەنا، تەنها لە سەنتەری دڵ نەخۆشەکانم دەبینی، دەمویست زیاتر شارەزای خەڵکەکە ببم و ئەوانیش شارەزای شێوازی من بن.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## نۆرەگرتن و پرسگە و بینینی نەخۆش

لـە میانـەی کارکردنـم لـە ئەڵمانیـا نەدەبـوو پرسـگە (اسـتعلامات) هەبێـت، یانـی هەمـوو نەخۆشـەکان لەسـەر کات و بـەرواری خۆیـان دەهاتـن، بـێ ئـەوەی هیـچ دەمەقاڵـێ و ناڕێکییـەک دروسـت ببێـت.

لێرە ئەوەم بەدی نەدەکرد، خەڵکەکە بەلێشـاو دەهاتنە نەخۆشـخانە، نـە کات دیـار بـوو نـە ڕێکی. لایان وابوو مادام نەخۆشـخانەی حوکمییە، ئیدی بەدڵی خۆیـان دەتوانن بێن.

کـەس بیری لـەوە نەدەکردەوە باشـە ئـەو هەمـوو نەخۆشـە چۆن بەجارێـک؟ بۆخاتـری خـوا کـێ دەتوانـی بـە پێـوەری زانسـتی بـاری تەندروسـتی نەخـۆش هەڵبسـەنگێنێت؟ لـەوێ کاتێکـی دیاریکـراو بـۆ نەخـۆش تەرخـان دەکـرا، بەلایەنـی کـەم هـەر نەخۆشـێک پێویسـتی بـە ٢٠ خولـەک هەیـە بـۆ ئـەوەی باسـی خۆییـت بـۆ بـکات. لێـرە لـە

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ڕاوێژکارییەکان کاتێ دەمویست ئەو کاتە بدەمە نەخۆش، لە دەرەوە دەبووە دەمەقاڵێ و شەڕ و کارمەندی پرسگە دەهات و دەیگوت: نەخۆشەکانی تر گلەیی ئەوەیان هەیە کە نەخۆش زۆر لە ژوورەوە دەمێنێتەوە. بێئاگا لەوەی دەمەوێ کاتیان پێ بدەم و مافی خۆیان وەربگرن، یان دیاردەیەکی تر کە بینینی چەند نەخۆشێک بوو بەیەکەوە، ئەوە خۆی شتێکە دژی مافی کەسی نەخۆش.

## شکاندنی هاوپیشەکانی خۆت

ئەزموون ڕۆڵێکی گرینگی هەیە لە دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی نەخۆش، ئەزموونی هەر پزیشکێک لەگەڵ پزیشکێکی تر جیایە، یاخود بۆچوونیان دەربارەی نەخۆشەکە و شێوازی مامەڵەکردن و چارەسەرکردنیشی بە هەمان شێوە. دەکرێ دوو پزیشک بەڵگەی جیایان هەبێ بۆ هەمان نەخۆش، هەردووکیان ڕاست بن و هیچکامیان هەڵە نەبن، بابەتەکە ئەوەیە کە هەر یەکێکیان لە گۆشەیەکەوە دەڕوانێتە شتەکان.

بۆیە دەمبینی جاری وا هەبووە کە من کارێکم بۆ نەخۆشێک کردووە، دواتر دکتۆرێکی تر وای لە نەخۆشەکە گەیاندووە کە ئەوە هەڵەیە، نەک تەنها بۆ من، بەڵکو دڵنیام بۆ زۆر دکتۆری تریش هەمان ڕەفتار ڕوویداوە. بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە ڕێز لە بۆچوون و چۆنییەتی مامەڵەکردنی دکتۆرەکە بگرین، لەلای نەخۆشەکان پێویست ناکات بە خراپ باسی هیچ دکتۆرێک بکەیت.

ئەوە کارێکی نا ئەخلاقییە، لێگەڕێن نەخۆشەکە خۆی بڕیار بدات کە دەیەوێ لەگەڵ کامە دکتۆر بەردەوام بێت. ئەوە شتێکە تەواو

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پەیوەستە بە ڕەزامەندی نەخۆش، چونکە هەندێ شت هەن تەواو پەیوەستن بە لایەنی دەروونی مرۆڤەکە، هەرچەندە تۆ پێی بڵێی کە فلان دکتۆر کەسێکی باشە یان زیرەکە، ئەو خۆی کە ئیدی قەناعەتی بە دکتۆرێک هەبوو، تەواو لێی گەڕێن با لەسەر ئەوە بەردەوام بێت، چونکە قەناعەت بەشێکە لە چارەسەر.

یاخوود دیاردەیەکی تر هەبوو لەناو نەخۆشەکان بەدی دەکرا، باسیان دەکرد کە فلانە دکتۆر نەشتەرگەری بۆ نەخۆشێک کرد، بەڵام نەخۆشەکە مرد یان خراپتر بوو، بەم چەشنە دکتۆرەکەیان بە خراپ لەقەڵەم دەدا، هەر ئەو خاڵەیان لەسەر دەگوتەوە، دەی خۆ ئەگەر هەڵە بێت یان هەڵە نەبێت، ناکرێ و جوان نییە هەموو کارەکانی تری ئەو دکتۆرە جارانی سفر بکرێتەوە.

مەگەر دکتۆریش مرۆڤ نییە؟ دواتر هەندێ شت هەیە لە دەستی مرۆڤ نییە، من هەموو جار بە نەخۆشەکانم دەڵێم، بڕێک شت لە کۆنترۆڵی ئێمەیە و هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەین، بەڵام لە کۆتاییدا شیفا لە دەست خوایە و کەس نازانێ چی ڕوودەدات، بۆیە پێویست ناکات هیچ کەس وا خۆی نیشان بدات کە هیچ کات هەڵە ناکات، یان هەموو کارەکانی بە باشی و بێ کێشە لە دەستی دەردەچن و هەموو نەخۆشەکانی سوود لە چارەسەرەکانی وەردەگرن.

باسکردنی هاوپیشەکەت بە خراپە لای نەخۆشەکانت، هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێت، یان پێیان بڵێی کە ئەو دەرمانانەی ئەو بۆی دانابووی هەمووی خراپە، چونکە ئەوە خۆی دڵەڕاوکێ لای نەخۆش دروست دەکات، ڕەنگە لەبارەی دەرمانەکانی تۆیشەوە گومانی بۆ دروست ببێت و نیشانەی پرسیار بێ بۆی.

بۆیە تکایە با ڕێز لە کار و بڕیاری هاوپیشەکانمان بگرین،

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

ئەگـەر زانیمـان هەڵەیەکـی زۆر دیـار هەیـە و زەرەری بـۆ نەخـۆش هەیـە، دەکـرێ لـە ڕووی یاسـاییەوە سـکاڵا تۆمـار بکەیـن.

جارێکیـان پرۆسـەی تاڵدانـان و تـۆڕ (قەسـتەرە و شـەبەکە) دانانـم بـۆ نەخۆشـێک کردبـوو. دوای ماوەیـەک نەخۆشـەکە تووشـی ئـازاری سـینگ هاتبـوو، مـن لـەو ماوەیـە لـە دەرەوەی وڵات بـووم، بۆیـە نەخۆشـەکە چووبـووە لای دکتۆرێکـی تـر، بـە نەخۆشـەکەیان گوتبـوو «شـەبەکەی بـە خـواری بـۆ دانـاوی، بۆیـە هێشـتا هەسـت بـە ئـازاری سـینگ دەکـەی». دواتـر نەخۆشـەکە بـۆی باسـکردم، لـە هەمـوو دونیـا شـتی وام گـوێ لـێ نەبـووە، شـەبەکو بـە خـواری دابنـرێ. ئیـدی ئـەوە و چەندیـن نموونـەی تـر، دڵنیـام هـەر پزیشـکێک ئـەو یادداشـتنامەیە بخوێنێتـەوە، هەمـوو ئـە حاڵەتانـەی دێتـەوە یـاد کـە هاوشـێوەن و ڕۆژانـە تووشـی هاتـوون.

## کردنەوەی نۆڕینگە

ئیـدی دوای دوو مانـگ لـە هاتنـەوەم بڕیـارم دا نۆڕینگـەی تایبـەت بکەمـەوە و ئێـواران نەخۆشـەکانم ببینـم. سـەرەتاکان نەخۆشـمان زۆر کـەم بـوو، بیرمـە کاتـم زۆر بـوو، لـە نۆڕینگـە کتێبـم دەخوێنـدەوە. ئیـدی بەرەبـەرە زیـاد بـوو. بـەو شـێوەیە دەسـتمان پێکـرد و بەردەوامیـن سـوپاس بـۆ خـوا.

لـە نۆڕینگـە بەحوکمـی ئـەوەی جۆرەهـا خەڵـک دەبینـی، لـە هـەژا و دەوڵەمەنـد، گـەورە و بچـووک، فێـر دەبـی چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ خەڵکـی بکـەی، یانـی فێـری هونـەری مامەڵەکـردن دەبـی. نەخۆشـی وا دەبینـی بـە کۆمەڵێـک کێشـەوە، بـەڵام قەناعەتـی هەیـە، نەخۆشـی واش دەبینـی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

شتێکی بچووکی هەیە، بەڵام ترسی لە مردن تۆقاندوویەتی.

هەی وای تێدایە لە تەمەنی ٦٠ ساڵییەوە یەکەم جارە دێتە لای دکتۆر، نەخۆشی واشمان هەیە لە منداڵییەوە نەخۆشە و لەڕێی نەخۆشخانە و دکتۆرە. ئیدی ژیان و گوزەرانی هەر یەکێک بە جۆرێکە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## نەبوونی متمانە بە پزیشکی وڵاتی خۆت

زۆر شتێکی باو بوو کاتێک کەسێکی دەوڵەمەند یان پارە دار تووشی کێشەیەکی تەندروستی دەبوو، خێرا بڕیاریان دەدا بیبەنە دەرەوە و لەوێ چارەسەری بکەن، هەتا ئەگەر چارەسەری لێرەش کرابا، زۆر جێگای پرسیار بوو لەلام باشە هەمان پرۆسەیە بۆ نایەنەوێ لێرە لەسەر دەستی ئێمەی پزیشکان بۆیان بکرێ و ئامادەبوون بڕە پارەیەکی زۆر سەرف بکەن و بڕۆنە دەرەوە؟

وەڵامەکە دیارە نەبوونی متمانەیە بە سیستەم و دکتۆری ئێرە، بەداخەوە ڕەنگە لە ڕێگای چەند نموونەیەکی خراپەوە تەواوی بابەتەکە ڕەشکرابێت، هەندێ جاریش تەنها لەبەر ئەوە بوو لای خەڵک بڵێن: دکتۆری دەرەوە (دکتۆری ئەورووپا) چارەسەری کردووە، وەک بڵێی ماددەی نەمرییان پێ دابێت ئیدی تووشی هیچ کێشەیەک نابێ.

پیاوێکم ناسی خاوەن سەنتەری ئوردنی بوو لە کوردستان، جارێک شتێکی خۆشی بۆ باس کردم و گوتی: ‹‹ئێمە لە وڵاتی خۆمان کێشەمان لەگەڵ ئەوە هەبوو نەخۆشەکانمان لە دکتۆری ئوردنی هەڵدێن؟ بۆ نایانەوێ لەسەر دەستی دکتۆری ئوردنی چارسەر وەربگرن! ئیتر بۆی دانیشتین و پلان و بەرنامەی کارمان بۆی دانا و هەوڵمان دا دوای ٢٠ ساڵ کارکردن و پێشکەشکردنی خزمەتی تەندروستی بە کوالێتی بەرز، گەیشتینە ئەوەی ئێستا هەر تاکێکی ئوردنی لە ئەمریکا و ئەورووپاش بێ دەبێ بەدوای دکتۆری ئوردنیدا بگەڕێن بۆ چارەسەر››.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

من خۆزگە دەخوازم لای خۆشمان وای لێبێت و ئەو پردی متمانەیە دروست بێتەوە و باشترین چارەسەر و کوالیتی و وردی لە کار پیشکەش بە هاونیشتیمانیان بکرێ و لە هەر شوێنێکی دونیا کوردێک بۆ چارەسەر بەدوای دکتۆرێکی کورددا بگەڕێ.

ڕووداوێکی سەیرم بەسەر هات لە ماوەی گەڕانەوەم نازانم هۆکاری چی بوو جارێک هەموو کاروبارەکانی مامەڵەی گەڕانەوەم لە ئەڵمانیا و دەستبەکاربوونم بزر بوو، نازانم چۆن نەما و چی لێ هات، بەڵام دەبوو هەموو شتەکان سەرلەنوێ پێشکەش بە وەزارەت بکەم و لە یەکەمەوە دەست پێ بکەم، جا ڕاپەڕاندنی کاری ئیداری لە بەڕێوبەرایەتییەکانی کوردستان بەڕاستی تاقەتپڕوکێنە و هیلاکت دەکە، بێ سیستەمی زۆر کات و هێزت لێ دەبەن.

لە ئەڵمانیا بۆ هەر مامەڵەیەک هەموو پەڕاوەکانت لە کۆمپیوتەردا هەڵدەگیرێ و پێوستی بەو هەموو ژوور کردنە نییە، لێرە دەبێ خۆت بیبەیە لای وەزیر، بەڕێوەبەری گشتی،... هتد. کارمەندێکی زۆر دامەزرێندراون لە ژوورێک و کارەکان هەر بە خاوی دەڕۆن، دەکرێ لەبری ئەوەی لە ژووری هاتوو و ڕۆیشتووی فەرمانە کارگێڕییەکان چوار کارمەند هەبێ بۆ ڕاپەڕاندنی کار، سیستەمێکی تۆکمە دابنێن و بە شێوازی ئەلیکترۆنی کارەکان بەڕێوە برۆن. دڵنیام دەگەینە ئەم ڕۆژانە، بەڵام نازانم کەی و ئێمە دەیبینین یاخود نا.

لە کوردستان کاتێک لە کۆلێژی پزیشکی دەردەچی، دەبێ دوو ساڵ پزیشکی خولاوە بیت، دواتر ساڵێک پزیشکی پلەبەند، دەتوانی ساڵی چوارەم داواکاری پێشکەش بکەی بۆ ئەو بەشەی کە دەتەوێت بۆی بخوێنیت، یانی دەبێ سێ ساڵ بە شێوەیەکی گشتی دەوام بکەیت، ئینجا ئەگەر مافی پێشکەشکردنت هەبێت بۆ هەندێ بەش، پێویستە ساڵێکی تریش چاوەڕوان بیت، بەڵام لە ئەڵمانیا

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

وانییە، هەر کە خوێندنی کۆلێژی پزیشکیت تەواو کرد، بۆت هەیە بچیتە ئەو بەشەی کە دەتەوێت دەوامی خۆت بکەی بۆ ماوەی چوار تا پێنج ساڵ، دواتر سەرۆکی بەشەکەت نامەیەکی پشتگیریت بۆ دەنووسێ بەو واتایەی شایەنی ئەوەی پلەی دکتۆرات پێ ببەخشرێ، دواتر تاقیکردنەوەیەکی تایبەت ئەنجام دەدەی (فاخ ارتز)، کە سەر بە سەندیکای پزیشکانە، لە بەشەکانی پێشوودا چۆنیەتی تاقیکردنەوەکەم باسکردبوو کە چەند بە سیستەمێکی تەواو ئەنجام دەدرێ و دادپەروەرانەیە.

یەکێک لە فەیلەسوفە ئەڵمانییەکان دەڵێ: متمانە زۆر گرینگە هەبێ، بەڵام لەوە گرینگتر ئەوەیە کۆنترۆڵی ئەو متمانەیە بکەی. لای ئەوان پشتگیری سەرۆک بەشەکەت یان شوێنەکەت زۆر گرینگترە لە تاقیکردنەوەکە، چونکە ئەو ئاگاداری هەموو شێوازی کارکردنت بووە و ئاگاداری بەرەوپێشچونەکانت بووە، چونکە جگە لە زانستەکە، ڕەوشت و هەڵسوکەوتەکانی دکتۆریش گرینگە، چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ نەخۆش، چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان، هەڵسەنگاندنی نەخۆشیش ڕەنگە بە یەکجار لە تاقیکردنەوەکەدا دەرنەکەوێت، بەڵام وەک پێویستییەک و لەڕووی ئەکادیمییەوە دەبێ تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدرێت.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

**لەکاتی ئەنجام دانی پرۆسەی تاڵدانان- قسطرە/ سەنتەری دڵ-هەولێر**

لە کوردستان پزیشک بە دەوامکردن لەو بەشەی کە لە بنەڕەتدا لێی دەوام دەکات و وەک ئیجبارییەک دەبێ سێ ساڵی خۆی دەوام بکات، کاتی زۆری لێ دەڕوات، ئینجا مافی پێشکەشکردنی هەیە. لە ئەڵمانیا کەسی وا هەبوو لە تەمەنی ٢٨ ساڵی پسپۆری هەبوو، یان لە تەمەنی سییەکان دوو دکتۆرای هەبوو، بە تەمەنێکی گەنجتر کاری دەکرد و وزە و توانای زۆری لەو بەشە خەرج دەکرد کە خۆی حەزی لێی بوو، بەڵام ئەو سێ ساڵە لایەنی باشی خۆی هەیە، چونکە بێگومان ئەزموون پەیداکردن و فێربوون زۆر شتە، بەڵام چەند لە دوارۆژ بەکەڵکت دێن و کاریان پێ دەکەی شتێکی ترە، هەر مرۆڤە و ڕای خۆی هەیە، هەیە پێی باشە ئەو سێ ساڵە لە بەشە جیاجیاکان دەوام بکات و هەیە پێی وایە کاتی لێ دەڕوات.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## هەڵسوکەوتی نەخۆشەکان لە کاتە ناخۆشەکاندا

کاردانەوەی نەخۆش سەبارەت بە حاڵەتە لەناکاوەکان، یاخود هەواڵە ناخۆشەکان، زۆر جیاوازبوون، جاری وا هەبووە نەخۆش لە ژووری قەستەرە گیانی سپاردووە، هەواڵەکە بە خێزانەکەی گوتراوە هیچ هەرا و هاوار و گریانمان نەبیستووە، نەخۆشەکەیان وەرگرتۆتەوە، ئەگەر سکاڵایان هەبووایە لەسەر ئەو کارەی بۆی ئەنجام دراوە، سکاڵایان تۆمار دەکرد بە شێوەیەکی یاسایی و کارەکان بە سادەیی دەڕۆیشتن.

لە وڵاتی خۆمان کارەکە پێچەوانەیە، نەک بە هەواڵی مردنی و ناخۆش، بەڵکو هەندێکجار حاڵەتێکی زۆر ئاسایی دەمانبینی کەسوکارێکی زۆری نەخۆش کۆدەبوونەوە و قەرەباڵغی زۆر دروست دەبوو، هەندێجار دەنگەدەنگی زۆریان دروست دەکرد، ئەمە کاردانەوەی خراپی هەبوو بۆ سەر نەخۆشەکانی تریش و بۆ سەر دکتۆرەکانیش.

چەند حاڵەت ڕوویداوە کاتێک هەواڵی مردنی کەسێک ڕادەگەیەندرێت، کەسوکاری پەنچەرە و دەرگای نەخۆشخانەیان شکاندووە و ئاژاوەیان دروستکردووە، ئەوە بۆتە هۆی ئەوەی کاریگەری لەسەر باری دەروونی نەخۆشەکانی تریش دروست ببێت.

پێم خۆشە دوو نموونە باس بکەم، جارێکیان لە ئەڵمانیا نەخۆشێکی تەمەن ٩٠ ساڵ لە نەخۆشخانە وەفاتی کرد، هەواڵمان بە کوڕەکانی دا، کاتژمێر ٣ی شەو بوو، گوتی: باشە، سوپاس بۆ ئاگادارکردنەوەکەتان، کەی بێم؟


WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

بەڕاستی هەرگیز ئەو وەڵامەم لەیاد ناچێ.

لە سیستەمێکی کەموکورتدا دەبێ واقیعێک قبووڵ بکەین کە بە هاتوهاوار و قیژە و جنێودان و تێکشکاندن، هیچ چارەسەر نابێ، بەڵکو خراپتری دەکەی و چەندین جار کێشە و ناڕەزایی نەخۆش لەم چەشنە ڕووداوانەدا گەیشتوونەتە ڕاگەیاندنەکان. ئەو ڕاستییەش لەیاد نەکەین کە هەندێجار کێشەکان لە لایەنی نەخۆشەوە ڕوودەدەن، جاری وا بووە ڕەزامەندی وەگیراوە و ئاگادار کراوەتەوە لە ئاڵۆزییەکانی دوای نەشتەرگەری، یان هەر پرۆسەیەکی تر، نەخۆش و هاوەڵی نەخۆش ئیمزا دەکەن، وەک بڵێی پزیشکەکە خۆی بەئەنقەست وای کردووە، دووبارە ئاماژەی پێ دەکەمەوە کە پێوستە نەخۆش ئەو هۆشیارییەی هەبێت دەربارەی پرۆسە نەشتەرگەرییەکان و ئاڵۆزییەکان دواتر.

## بابەتی دەرمان و کۆمپانیای جیاجیا

لە ئەڵمانیا ئەو بابەتە لەلایەن حکومەتەوە کۆنترۆڵ کراوە، بەو واتایەی حکومەت خۆی هەڵدەستێ بە دابینکردنی دەرمان لەو کۆمپانیانەی کە باشترین کوالێتیان هەیە، ئیدی پزیشک کێشەی نییە، چونکە دەزانێت ئەوەی لە دەرمانخانەکان دەدرێ بێ کێشەیە و باشترین جۆرە و نەخۆش سوودی زۆری لێ دەبینێ. شتێک نییە بە ناوی زیان، بەڵکوو هەموو سوودمەند دەبن، چونکە بابەتەکە لە ئاستێکی بەرزتر لە تاکە کۆمپانیایەک کۆنترۆڵ کراوە.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

## ترس له مردن

زۆر سەرسامی ئەو ڕاستگۆیی و ڕاشکاویەم کە لە نێوان پزیشک و نەخۆشی ئەڵمانیدا هەبوو، هیچ شتێک لە نەخۆش ناشاردرێتەوە و چۆنە وا بۆی ڕوون دەکەنەوە، جارێکیان لە سەنتەری دڵ نەخۆشێکی تەمەن ٧٠ساڵیان هێنا، کە تووشی شێرپەنجە ببوو، ویستم بۆی ڕوون کەمەوە کە دیارە حاڵەتەکەی چییە، پێویستی بەشتێکی تر نییە تەنها ئازارشکێن، تا ئەو کاتەی ماڵئاوایی دەکات، بەڵام هەر خێرا کچ و کوڕەکانی ئاماژەیان بۆ کردم کە پێی نەڵێم و لێی بشارمەوە و وایان چرپاند کە با نەزانێ باشترە، باشە ئەوە سەرەتاییترین مافی نەخۆشە کە بزانێت چییەتی، بەڵام بۆچی دەبێت لێی بشاردرێتەوە!

ئەو نەخۆشە گەنجە ئەڵمانییەم هاتەوە یاد کاتێک پێمان گوت: نەخۆشییەکەت تەشەنەی کردووە و ئومێدی چاکبوونەوەت کەمە، بەڵام کاردانەوەی چەند جیاواز بوو، زۆر واقیعبین بوو و ڕازی بوو بەوەی بەسەری هاتووە. بۆیە زۆر گرینگە نەخۆش بزانێ چییەتی، بەڵکو کابرای نەخۆش کارێکی هەبێت و بیەوێت بیکات، یان ڕایپەڕێنێت یاخود وەسیەت بنووسێت، مردن بەشێکە لە ژیان و ناکرێ مرۆڤ لێی هەڵبێ. هەمووان ڕووبەڕووی دەبینەوە، مەرجە بەجۆرێک بژین هەموو کات ئامادەبین بۆ مردن.

بە قسە هەموو دەڵێین لە مردن ناترسین و بە بەشێکی ژیانی دەزانین، بەڵام کاتێک تووشی حاڵەتێکی ئەوها دەبین، ئینجا تێگەیشتنە ڕاستەکان بەدیار دەکەون.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

نموونـەی ڕەوشـتی بـەرزی نەخۆشـێکم لەیـاد ناچـێ کاتێـک لـە قۆناغـە کۆتاییەکانی نەخۆشی پێکەوتنی دڵ بـوو «عجـز القلـب» بـاری تەندروسـتی خـراپ بـوو، بـەڵام لەهەمـان کاتـدا دەیزانـی کـە ئیتـر لـە قۆناغێکـە ناتوانـرێ شـتێکی لەگـەڵ بکـرێ، لەگـەڵ ئـەو هەمـوو ئـازار و مەینەتییـەی، سوپاسـی ئێمـەی دەکـرد کـەوا لەگەڵـی مانـدوویـن و زەحمەتمـان کێشـاوە.

ئەو هەستەی کە نەخۆشیی خۆت نەخەیتە ئەستۆی کەس، لوتکە مرۆڤبوونـە، چونکـە هەنـدێ نەخۆشـمان هەیـە بـە هەمـوو شـێوەیەک ڕەتی دەکاتـەوە، کـە لەشـی خـۆی یان شـێوازی ژیانی بەرپرسـە لەوەی کە ڕوویداوە، هەمیشـە لۆمـەی پزیشـک دەکات بە وەی نەیزانیوە یـان نەیتوانیوە تـەواو چارەسـەری بکات.

پێم باشـە شـتێکی زۆر سـەرەنجڕاکێش بـاس بکـەم کـە لـە ئەڵمانیـا هەبـوو و کاری پـێ دەکـرا، لـە نـاو نەخۆشـخانەکان نووسـینگەی تایبەت هەبوو بۆ کاروبـاری ڕێوڕەسـمی مـردن و ناشـتنی جەنـازە (مكتـب الوفيـات)، واتـە هـەر کەسـێک بیەوێت، دەتوانـێ بچێتە ئەو نووسـینگانە و نـاوی خـۆی تۆمـار بـکات، کاتـێ کـە دەمرێت چـی بـۆ بکرێت و چۆن بنێژرێت و گووڵـی سـەر گۆڕەکـەی چـۆن بێت و لـە کوێ بنێژرێت.

تەنهـا بـە ڕێکخسـتنی ژیانـی ئێسـتایانەوە نەوەسـتاون، بەڵکـو دەسـتیان کـردووە بـە ڕێکخسـتنی مردنیشـیان و کاتیـان بـۆ ڕێکـەوت و پەلەپـەل نەهێشـتۆتەوە و پێشـوەختە ڕێکیـان خسـتووە.

ڕەنگـە هۆکارەکـەی بـۆ ئـەوە بـێ کـە پەیوەنـدی خێزانـی و کۆمەڵایەتـی لـەوێ کـزە و ئـەو تێکەڵییـە نییـە کـە لێـرە هەیـە، بـەڵام بەشـێکی زۆریشـی بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە خۆیـان عەقڵیەتێکـی زرنگیـان هەیـە و دەیانـەوێ و لـە هەوڵـدان کارەکانیـان بـە باشـترین شـێوە ڕێکبخـەن.



WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

# گرینگیدان بە توێژینەوەی زانستی

هەموو جۆرە زانستێک هەمیشە لە پێشکەوتن و گۆڕان دایە، زانستی پزیشکی بەهۆی هەڵسوکەوتی بەردەوام و ڕاستەوخۆ لەگەڵ خودی مرۆڤ، هەمیشە پێویست بووە شێوازی چارەسەر و ئامرازەکان بەرەوپێش ببردرێن و زۆرترین سوود و کەمترین زیان بگەیەنرێتە کەسی چارەخواز، یەکێک لەو ڕێگایانەی دەتوانی ئەو گۆڕانکارییەی پێ دروست بکەی، ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی و وردبوونەوەیە لە هۆکار و کاریگەرییەکان، بەم جۆرەش گەیشتوون بە ئەنجامی نوێ.

لەو نەخۆشخانەیەی کارم لێی دەکرد (ڕۆستۆک) ژوورێکی تایبەت بە ئەنجامدانی توێژینەوە هەیە، سەرۆک بەشەکەم هەر توێژینەوەیەکی دەدایە پزیشکێک بە هاوکاری سێ پەرستار، ئەو توێژینەوەیە لە ئەستۆی ئەوان بوو. ئەوەی من لێی بەرپرس بووم لەسەر جۆرە دەرمانێکی نوێ بوو کە تازە داهێنرا بوو، لەسەر نەخۆشی نوێ تاقیمان دەکردەوە و چاودێری کاریگەرییەکانیمان دەکرد، ئەو سەنتەرەی سەرپەرشتی ئەو جۆرە توێژینەوانەی دەکرد، کۆبوونەوەیەکی ئەنجام دەدا لە میونخ، هەموو سەرپەرشتیارانی کۆکردەوە لە هەر نەخۆشخانەیەک لە وڵاتانی دونیا، نەخشەی نەخۆشخانە بەژداربووەکانیان لەو توێژینەوەیەدا خستەڕوو، ئەوەی زۆر لام سەیر بوو کەمترین وڵات لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەژدار بوون، وردتر بڵێم لە مەغریبی عەرەبی تا سەرەوەی وڵاتی تورکیا،

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

هیچ کام لەو وڵاتانە بەژدار نەبوون، بەشێوەیەکی گشتی وا هەست دەکەم لەو وڵاتانە کەمتر گرینگی بە ئەنجامدانی توێژینەوە دەدرێ، چونکە پارە ناکات و کەم کەس بەلایدا دەڕوات، خۆی پێوە خەریک دەکرێت، بگرە هەندێ کەس بە کارێکی زیادی دادەنێن.

کاتێک توێژینەوەکەمان بۆ ئەو نەخۆشانە ڕوون دەکردەوە کە دەمانویست بەژدار بن، کەسێکیان ناڕەزاییان نەبوو، کاتێک دەمانگوت ئەو دەرمانە تاقینەکراوەتەوە و دەمانەوێ بزانین کاریگەری چۆنە، زۆر بە دڵخۆشییەوە وەڵامیان دەدایەوە و لایان گرینگ بوو لە شتێک بەژدار بن کە لە داهاتوودا خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکات. هەر ئەو گرینگییەی لەوێ بەدیم کرد لەسەر ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی، بڕیاری ئەوەم دا لەگەڵ کاری خۆم تیمێک بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی دروست بکەم و گرینگی پێ بدەین و لە داهاتووشدا بتوانین سەنتەرێک بۆ توێژینەوەی زانستی دابمەزرێنین.

سوپاس بۆ خوا لە ئێستادا بە هاوکاری پزیشکێکی گەنجی چالاک، بەردەوامین لە ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی و بۆتە بەشێک لە کارە گرینگەکانی ڕۆژانەمان، بەئومێدی ئەوەین لە داهاتوودا بتوانین کارەکە گەورەتر بکەین، نەک تەنها لەسەر ئاستی هەولێر، بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو شارەکانی عێراق لەگەڵ تیمێکی گەورە، بۆ ئەوەی بەژداربین لە دروستکردنی بەشێکی زانستەکە، چونکە ئەو دێڕانەی لە کتێبە زانستییەکان نووسراونەتەوە و بوونەتە بەڵگەی زانستی، لەو توێژینەوانەوە هاتوون کە کراون. جا زۆر گرینگە بەم عەقڵیەتەوە بیر بکەینەوە، بۆ ئەوەی دەستمان هەبێت لە باشترکردن و چەسپاندنی زانستەکە و گەڕان و لێکدانەوەی هۆکارەکانی چەندەها نەخۆشی.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

پرۆفیسۆرەکەم هەموو جار دەیگوت: دکتۆر شوان مەرج نییە ئەوەی لە کتێبەکاندا نووسراوە، بۆ هەموو نەخۆشێک ١٠٠٪ ڕاست بێت، بەڵکو ئەوە بەهەند وەربگرە زیاتر کە خۆت لێرە لەگەڵ نەخۆشەکان دەیبینی، بێگومان باوەڕبەخۆبونی ئەو لە قۆناغێکی ئەوەندە بەرز بوو، کە پێی وابوو دەتوانێت بەڕاستی داهێنان لە زانستی پزیشکیدا بکات و هەروایش بوو، ئەوەش کاریگەری زۆری لەسەر منیش دروست کردووە. گرینگە ئێمەیش خاوەن داتای خۆمان بین و تەنها تەماشاکەر نەبین، بەڵکو لێکدانەوەی تایبەتمان هەبێت بۆ خەڵکی وڵاتی خۆمان.

## تێکەڵکێشکردنی ئەزموونی دەرەوە و پراکتیزەکردنی پیشەکەم لە کوردستان

دوای چەندین ساڵ ژیانم لە وڵاتی ئەڵمانیا «شارەکانی زارلاند ڕۆستۆک» کاتێک گەڕامەوە لەسەرم پێوەست بوو ئەوەی فێری ببووم، هەوڵی جێبەجێکردنی بدەم لە ڕووی چارەسەری پزیشکی و چۆنیەتی هەڵسوکەوتم لەگەڵ نەخۆشەکان و بەرەنگاربوونەوەی کێشەکانی ڕۆژانەم. بڕێک زەحمەت بوو، لەبەر ئەو هۆکارانەی کە باسمکردن لە ڕووی سیستەمی تەندروستی و لایەنی هۆشیاریی نەخۆش، بەڵام ئەگەر لێم بپرسن کە چەند توانیم ئەزموونەکان تێکەڵکێش بکەم؟ دەتوانم بڵێم وەڵامی ئەو پرسیارە ڕێژەییە، هەندێ جار لە هەندێ نەخۆشخانە کە کوالێتی ئامێر و سیستەمی تەندروستیان فەراهەم کردووە، توانیومانە باشترین کوالێتی پێشکەش بکەین، یان هەندێجار مامەڵەمان لەگەڵ هەندێ نەخۆشی

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

تێگەیشتوو و هۆشیار کردووە، ئیدی کایەکانی زۆر بۆ ئاسان کردووین.

ناکرێ و ناگونجێ هەموو شتەکان ٪۱۰۰ جێبەجێ بکەی، چونکە لە بنەڕەتدا دوو کۆمەڵگای جیاوازین، بەڵام هەمیشە و ئێستا و داهاتوو ئێمە هەر بەدوای باشترین کوالێتییەوە دەبین و وردی لە دەستنیشانکردن و چارەسەرکردن ئامانجی سەرەکیمانە.

لەکۆتاییدا دەمەوێ بڵێم ئەڵمانیا ئەو وڵاتە بوو منی بە دیوێکی زۆر جوانی مرۆڤایەتی ئاشناکرد، زانست، هەوڵدان، پێشکەوتن و کۆمەڵێک بەهای زۆر جوانی تر.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM

# کورتەیەک لە ژیانی نووسەر

- کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی صلاح الدین / هەولێر لە ساڵی **1999_2000**
- دکتۆرا لە نەخۆشیەکانی دڵ و هەناو ئەڵمانیا
- دکتۆرا لە جۆرەکانی تۆڕ ( شبکە ) و فراوانکردنی خوێنبەرەکانی دڵ ئەڵمانیا
- دکتۆرا لە نەخۆشیەکانی دڵ ( قسطرە ) و دانانی ئامێری ترپەرێکخەری دڵ ئەڵمانیا
- ڕاهێنراو لە سەنتەری تایبەت بە چارەسەرکردنی نەخۆشی پەککەوتنی دڵ ( ئیسپانیا ) و نەخۆشی بەرزی فشاری خوێن لە سییەکان لە ئیتاڵیا لەسەر دەستی پرۆفیسۆر گالی
- ڕاهێنراو لە نەخۆشخانەی ڕۆیال برۆمپتۆن لە لەندن، لەلایان پرۆفیسۆر کریستۆف- نین ابر، بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی دانانی تۆڕ بۆ شادەمار **EVAR**
- بەشداربووی چالاک بووە لە کۆنگرەکانی نەخۆشیەکانی دڵ لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا - شیکاگۆ، واشنتۆن، لۆس ئەنجلۆس هیوستن
- بەشداربووی چالاک بووە لە کۆنگرەکانی نەخۆشیەکانی دڵ لەوڵاتی یابان - تۆکیۆ
- خاوەنی دوو کتێبی ترە بە ناو نیشانی کورتەیەک لەبارەی نەخۆشییەکانی دڵ و زانستی نەخۆشیەکانی دڵ

## ئەو توێژینەوە زانستیانەی کە ئەنجامی داون

1-Efficacy and safety of Promus-Stent in comparison with Cypher,Taxus and Endeavor Stents in Ischemic Heart Disease Patients with 6 months follow up.

2-Impaired mobilization of CD133(+) bone marrow -derived circulating progenitors with an increased number of Diseased coronay arteries in IHD patients with DM

3-Enhanced mobilization of the bone marrow- derived circulating progenitor cells by Intra coronary freshly isolated bone marrow cell transplantation in patients with Acute Myocardial Infarction

4-Coronary Artery Disease among patients younger than 35 years od Age: Exploring the most common risk factors

5-Reduced number AMI cases at the time of lockdown during the COVID-19 Pandemic in Northern Iraq: Exploring the Possible explanations Behind.

6-The most common additional risk factors of CAD in smoker patients Specifically: Shedding light on Smoker's Angiographic Profile

7-Biochemical markers affecting left ventricular ejection fraction in patients younger than 35 years of age with established coronary artery disease.

8-Associations of Vitamin D deficiency with Acute Myocardial infarction in Kurdish Patients.

9-The impact of Ramadan fasting on Acute Coronary Disease events among Iraqi Population.

10-Association of Hyperhomocysteinemia with Acute Myocardial Infarction in Kurdish Patients.

11-Association of Arterial Hypertension with Acute Myocardial Infarction among Iraqi Patients.

12-association of obstructive sleep apnea with cardiovascular health.

13- Prevalence persistent symptoms after acute COVID-19 among Iraqi Patients

14-Assessment of psychological aspect of polypharmacy among patients with chronic diseases.

15-Safety of PCI during Ramadan Fasting among patients with ischemic heart disease: a comparison study.

16-The mortality rate of CABG, that has been performed among iraqi patients.

17-The incidence of uncontrolled hypertension, among hypertensive patients that has been checked in an Ambulatory Database.

18-The prevalence of Recovery from Dilated Cardiomyopathy postpartumly among kurdish pregnants.

WWW.IQRA.AHLAMONTADA.COM